2 ـ ( اللهم إني أعوذ بك من عذاب القبر،وأعوذ بك من فتنة المسيح الدجال،وأعوذ بك من فتنة المحيا وفتنة الممات، اللهم إني أعوذ بك من المأثم والمغرم ) ، واتـه : خوايـه پەنا ئـەگرم لـەسزای گۆڕو پـەنات پێ ئـەگرم لـە ئـاشوبـەی مـەسیحی دەجال و پـەنات پێ ئـەگرم لـە ئـاشوبـەی ژیان و مردن ، خوایە پـەنات پێ ئـەگرم لـە گوناە و قـەرزاری .

3 ـ ( اللهم إني ظلمت نفسي ظلماً كثيراً ، ولا يغفر الذنوب إلا أنت ، فاغفر لي مغفرة من عندك وارحمني إنك أنت الغفور الرحيم ) ، واتـە : خوایـە ستـەمم لـەنـەفسی خۆم کردووە ستـەمێکی زۆرو کـەس لـەگوناهو تاوان خۆش نابێ جگـە لـە تۆ . سا خوایـە لێم خۆش ببـە ، بـە لـێ خۆشبوونی خۆت و ڕەحمم پێ بکـە ، بـەڕاستی خۆت لـێ بووردەو بـەخشندەیت .

4 ـ ( اللهم اغفر لي ما قدمت وما أخرت وما أسررت وما أعلنت وما أسرفت وما أنت أعلم به مني أنت المقدم وأنت المؤخر لا إله إلا أنت ) ، واتـە : خوایـە لـەو گوناهانـەم خۆش بـە کـەپێشم خستووەو پاشم خستووەو پـەنهانم کردووەو ئاشکرام کردووەو زیادەڕەویم تێدا کردوە ، وەلـەهـەموو ئـەوانـەی کـەتۆ زاناتری پێی لـەمن ، پـەرستراوێک نییـە بـەهـەق جگـە لـەتۆ .

5 ـ ( اللهم أعني على ذكرك ، وشكرك وحسن عبادتك ) ، واتـە : خودایـە کۆمـەکیم بکـەو یارمـەتیم بدە لـەسـەر یادکردنت و سوپاس کردنت و چاک پـەرستنت .

6 ـ ( اللهم إني أعوذ بك من البخل وأعوذ بك من الجبن ، وأعوذ بك من أن أرد إلى أرذل العمر ، وأعوذ بك من فتنة الدنيا وأعوذ بك من عذاب القبر ) ، واتـە : خودایـە کۆمـەکیم بکـەو یارمـەتیم بدە لـەسـەر یادکردنت و سوپاس کردنت و چاک پـەرستنت .

7 ـ ( اللهم إني أسألك الجنة وأعوذ بك من النار ) ، واتـە : خوایـە داوای بـەهـەشتت لـێ دەکـەم و پـەنات پێ یـەگرم لـە یاگری دۆزەخ .

8 ـ ( اللهم بعلمك الغيب وقدرتك على الخلق أحيني ما علمت الحياة خيراً لي وتوفني ما علمت الوفاة خيراً لي ، اللهم وأسألك خشيتك في الغيب والشهادة ، وأسألك كلمة الإخلاص في الرضا والغضب ، وأسألك القصد في الفقر والغنى ، وأسألك نعيماً لا ينفد ، وأسألك قرة عين لا تنقطع ، وأسألك الرضا بعد القضاء ، وأسألك برد العيش بعد الموت ، وأسألك لذة النظر إلى وجهك والشوق إلى لقائك من غير ضرَّاء مضرة ولا فتنة مضلة ، اللهم زينا بزينة الإيمان ، واجعلنا هداة مهتدين ) ،

واتە : خوایە بە زانینت بەغەیب و نهێنی و نادیارەکان و بەتوانای خۆت بەسەر دروست کراواننتدا بمژێنە تا ئەوکاتەی خۆت ئەزانیت ژیان چاکە بۆم و بممرێنە هەر کات مردن چاکە بوو بۆم ، خوایە داوای ترسانت لێ دەکەم لەتۆ بەپەنهانی و ئاشکراو داوای ووشەی هەق ورەوات لێ دەکەم لەکاتی رازی بوون و تووڕەیمدا ، وەداوای مامناوەندیت لێ دەکەم لەدەوڵەندی و هەژاریم دا . وەداوای نیعمەتێکت لێ دەکەم کە نەبڕێتەوە وخۆشەویست و بینایی چاوێک کە نەپچڕێ و لەبەر چاو وون نەبێت ، وە داوای ڕازی بونت لێ دەکەم لەدوای قەزاو بڕیارت بەسەرم دا ، وە داوای ژیانێکی خۆش و فێنکت لێ دەکەم لەدوای مردن ، و داوای چێژی تێ ڕوانینت لێ دەکەم بۆ ڕووی یرۆزت و تامەزرۆیی بینیبت بەبێ نارەحەتیەکی زیان گەیەن و ئاشوبەیەکی گومڕاکەر ، خوایە بمان ڕازێنەرەوە بە جوانی ئیمان و بمناکە بەرێنمومی کەرانی ڕێنمونی کراون .

9ـ ( اللهم إني أسألك يا الله بأنك الواحد الأحد الصمد الذي لم يلد و لم يولد و لم يكن له كفواً أحد أن تغفر لي ذنوبي إنك أنت الغفور الرحيم ) ،

واتە : خوایە من داوات لێ دەکەم ئەی خوایە بەوەی کەتۆ تاک و تەنیاو جێی نیازی ، ئەو خوایەی نەکەست لێ بووەو نەلەکەس بوویت و کەس لەهاو وێنەو هاوتای تۆ نی یە ، داوات لێ ئەکەم لە گوناهەکانم خۆش بیت بەڕاستی تۆ لێبوردەو بەخشندەیت .

10ـ ( اللهم إني أسألك بأن لك الحمد ، لا إله إلا أنت وحدك لا شريك لك ، المنان ، يا بديع السموات والأرض يا ذا الجلال والإكرام يا حي يا قيوم إني أسألك الجنة وأعوذ بك من النار ) ، واتە : خوایە من لێت دەپاڕێمەوە بەوەی کەستایش بۆتۆیە هیچ پەرستراوێک نی یە بەهەق جگە لەتۆ ، تەنیای بێ هاوەڵی تۆ ، تەنیای بێ هاوەڵی تۆ خاوەن و شایستەی فەزڵ و منەت کردنی . ئەی داهێنەری ئاسمانەکان و زەوی ئەی خاوەنی شکۆو ڕێز ، ئەی زیندوی مشۆرگێڕو هەڵسوڕێنەری بوونەوەر من داوای بەهەشتت لێ دەکەم و پەنات پێ ئەگرم لە ئاگر .

11ـ ( اللهم إني أسألك بأني أشهد أنك الله لا إله إلا أنت،الأحد الصمد الذي لم يلد و لم يولد و لم يكن له كفواً أحد ) ، واتە : خوایە من ئەپاڕێمەوە لێت بەوەی کەمن شایەتی دەدەم کەتۆ ( ) یت هیچ پەرستراوێک نی یە بەهەق جگە لەتۆ ، تاکی جێ ی نیازی کەست لێ نەبوەو لەکەسیش نەبەووت و کەس هاوشێوەو هاوتای تۆ نی یە .

12 ـ ( اللهم حاسبني حسابا يسيرا ) ، واتـه : خوايه ( لـه رۆژێ دوايـی دا ) بـه لـێ پرسينـهوەيـەكی ئـاسان لـێ پرسينـهوەم لـەگـەڵ بكـه .
13 ـ (اللهم إني أعوذ بك من شر ما عملت ومن شر مالم أعمل (بعد) ) ،
واتـه : خوايه من پـەنـات پـێ دەگرم لـەخراپەی ئـەوەی كه ئـەنجامم داوەو كردومـه لـه تـاوان و خراپـه ، وه لـەخراپەی ئـەوەی كـه نـەمكردووەو هێشتا ئـەنجامم نـەداوه لـه چاكـه .
14 ـ وه ئـەتوانـی بپاڕێتـەوه لـەم نێوانـەدا تـا سڵاوی نوێژ دەداتـەوه بـه هـەر پاڕانـەوەيـەك كـه خۆی پێی بـاش بێت .
زانـايـانـی سـەلـەف دەفـەرموون : بـەڵام بـاشتر وايـه چی ( وارد ) بـووه لـەم كاتـەدا ئـەوه بخوێنێ بـەتـايـبـەت لـه نوێژه فـەرزەكـانـدا .

ويردی دوای سڵاودانـەوەی نوێژ
1 ـ سێ جار بڵـێ (أستغفر الله) ، ئـينجا بڵـێ : ( اللهم أنت السلام ، ومنك السلام ، تباركت يا ذا الجلال والإكرام ) ، واتـه : خوا گـەورەيـه ، داوای لـێخۆشبوون لـه خوا دەكـەم .. خوايـه تۆ سـەلامـی و ئـاشتـی و سـەلامـەتـيش لـه تۆوەيـه ، پـاكـی و بـێ گـەردی بۆ تۆيـه ئـەی خـاوەنـی شكۆ و ڕێز .
2 ـ ( لا إله إلا الله وحده لا شريك له،له الملك وله الحمد وهو على كل شئ قدير، اللهم لا مانع لما أعطيت ، ولا ،عطي لما منعت ، ولا ينفع ذا الجد منك الجد ) ،
واتـه : هـيچ پـەرستراوێك نـی يـه بـەهـەق جگـه لا ( ) تـاكـی بـێ هـاوبـەشـه ، موڵك و ستـايش بۆ ئـەوەو بـەسـەر هـەموو شتێك دا بـەتوانـايـه ، خوايـه ڕێگر نـی يـه بۆ ئـەو شتـەی تۆ دەيبـەخشی و بـەخشـەر نـی يـه بۆ ئـەو شتـەی تۆ دەيگرتـەوەو هـيچ خـاوەن پـايـەو دەسـەڵاتێك دەسـەڵاتـەكـەی سوودی نـی يـه بۆی لـه ڕۆژی دوايـی دا لـه سزای تۆ .
3 ـ ( لا إله إلا الله وحده لا شريك له،له الملك وله الحمد وهو على كل شئ قدير،لا حول ولا قوة إلا بالله،لا إله إلا الله،ولا نعبد إلا إياه ، له النعمة وله الفضل ،وله الثناء الحسن،لا إله إلا الله مخلصين له الدين ولو كره الكافرون ) ،
واتـه : هـيچ پـەرستراوێك نـی يـه بـەهـەق جگـه لـه (الله) تـاك و بـێ هـاوبـەشـه ، موڵك و ستـايش بۆ ئـەوەو بـەسـەر هـەموو شتێك دا بـەتوانـايـه ، هـيچ گۆڕان و هـێزێك نـی يـه مـەگـەر بـەخواوه ، هـيچ پـەرستراوێك نـی يـه بـەهـەق جگـه لـه (الله) وەجگـه لـەو كـەس نـاپـەرستين ، نيعمـەت و فـەزڵ و ستـايشی چاك بۆ ئـەوه

، هیچ پەرستراوێک نی یە بەهەق جگە لە (الله) ، بەدڵسۆزی دینداری بۆ دەکەین ئەگەر چی بێ باوەڕان پێ یان ناخۆش بێ .

4ـ (سبحان الله) سی و سێ جار ، (الحمد لله ) سی و سێ جار ، (والله أكبر) سی و سێ جار ، ئینجا بڵێ : ( لا إله إلا الله وحده لا شريك له ، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير ) .

( هەرکەسێک ئەمە بڵێت لەدوای هەموو نوێژێکی فەرز ئەوا خوای گەورە لە گوناهەکانی خۆش دەبێ ئەگەر چی بەوێنەی کەفی دەریا بێت )

5ـ بسم الله الرحمن الرحيم ( قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ*اللَّهُ الصَّمَدُ*لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ * وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُواً أَحَدٌ ) و ( قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ * مِن شَرِّ مَا خَلَقَ *وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ * وَمِن شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ * وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ) و ( قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ * مَلِكِ النَّاسِ * إِلَهِ النَّاسِ *مِن شَرِّ الْوَسْوَاسِ الْخَنَّاسِ * الَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ * مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ ) بخوێنە لەدوای هەموو نوێژی فەرز .

6ـ خوێندنی( آية الكرسى) لەدوای هەموو نوێژێکی فەرز ( اللّهُ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لاَ تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلاَ نَوْمٌ لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلاَ يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِ إِلاَّ بِمَا شَاء وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَلاَ يَؤُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ ) .

( هەر کەسێ لەدوای هەموو نوێژێکەوە بیخوێنێت هیچ ڕێگری نی یە لەچوونە بەهەشت جگە لەوە نەبێ بمرێ ) .

7ـ ( لا إله إلا الله وحده لا شريك له ، له الملك وله الحمد ، يحيي ويميت وهو على كل شئ قدير ) ، دە جار لە دوای نوێژی مەغریب و بەیانی .

( ئەمە پێش هەستان لە جێگەکەی خۆت و قاچ جوڵاندن دەوترێ ( هەر کەسێک ئەم نزایە بڵێت لە دوای نوێژی بەیانی و ئێوارەوە ئەو بە هەر دانەیەکی 10 چاکەی بۆ دەنوسرێت و 10 خراپەی لێ دەسڕێتەوە و 10 پلەش بەرز دەبێتەوە و دوپارێزرێت لە هەموو خراپەیەک و دەپارێزرێت لە شیطان ، وە هیچ گوناهێک نایگرێتەوە ، جگە لەو باشتری ووتبێت ) .

وە لە فەرموودەی تردا هاتووە کە ( هەر کەسێک دە جار بیڵێ لە دوای نوێژی بەیانی یەوە ئەوا کۆمەڵێک فریشتەی بۆ دەنێردرێت تا لە شەیطان بیپارێزن

تا بەیانی و دە چاکەی رزگار کەری بۆ دەنوسرێت و دە گوناهی لەناوبەری دەسڕێتەوە و پاداشتی رزگار کەردنی دە بەندی بڕواداری بۆ دەنوسرێت .

8ـ ( اللهم إني أسألك علماً نافعاً ، ورزقاً طيباً ، وعملاً متقبلاً "بعد السلام من صلاة الفجر ) ، لە دوای سڵاو دانەوە لە نوێژی بەیانی .

واتە : خوایە داوای زانستێکی بە کەڵکت لێ دەکەم ( کە کردەوەی لەگەڵ دا بێت ) لەگەڵ ڕۆزی یەکی پاک و حەڵاڵ و کردەوەیەکی وەرگیراو .

## ئەگەر لە نوێژدا بوویت و بانگیان کردیت

پیاو دەبێت بڵێت : (سبحان الله) وە ئافرەت چەپڵە لێ بدات ( واتە : بە بەری دەستی ڕاستی بکێشێ بە پشتی دەستی چەپی دا تا بزانن کە نوێژ دەکات ) .

ئەگەر دوو دڵیت بۆ دروست بوو لە نوێژەکەت یان قورئان خوێندنەکەت دا لە عوثمانی کوڕی عاصمەوە ( خوا لێی رازی بێت ) فەرمووی ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا شەیطان دێتە نێوان من و نوێژەکەم و قورئان خوێندنەکەم ولێم تێک دەدات ، پێغەمبەری خوا درودی خوای لێبێت فەرمووی : ( ئەوە شەیطانێکە پێی دەوترێ ، خەنزەب یان (خینزەب) ،هەر کاتێک هەستت پێکرد پەنا بگرە بە خوا لێی (أعوذ باللە من الشيطان الرجيم) وە سێ تف بکە بە لای چەپت دا .

## پاڕانەوەی قنوتی ویتر

شوێنی ئەم دوعایە پێش چەمینەوە ( ركوع ) ە بە پێچەوانەی قنوتی کاتی سەغڵەتی ( النازیلة ) ە وە کە لەدوای چەمینەوەدا دەکرێ ، وە لە پێغەمبەرەوە درودی خوای لێبێت  نەهاتووە کە دەستی بەرزکردبێتەوە لە قنوتی ویتردا . بەڵام لە هەاوەڵەکانەوە ڕەزای خوایان لێبێت هاتووە هەردوو شێوازەکە دروستە ، وە صڵاوات دانیش لەدوایەوە لە سەلەفەوە وارد بووە .

(اللهم اهدني فيمن هديت ، وعافني فيمن عافيت ، وتولني فيمن توليت ، وبارك لي فيما أعطيت ، وقني شر ما قضيت ، فإنك تقضي ولا يقضى عليك ، إنه لا يذل من واليت ،[ ولا يعز من عاديت ] تباركت ربنا وتعاليت ) . واتە : خوایە ڕێنمویم بکە لەگەڵ ئەوانەدا کە ڕێنمویت کردوون ، وە پارێزراوو لەش ساغم بکە لەگەڵ پارێزراواندا ، وەپشتم بگرە لەگەڵ پشتگیری لێ کراواندا ، وە لەوەی دەیبەخشیت پێم بەرەکەتی تێ بخەو لەخراپەی ئەوەی بڕیارت لەسەری

داوه بمپارێزه ، بەڕاستی تۆ بڕیار دەدەیت و کەس بڕیار نادات بەسەرتدا ، وه ئەوەی تۆپشتی بگریت هەرگیز زەبوون نابێ و ئەوەی تۆ دوژمنایەتی بکەی هەرگیز بەعیزەت و بەدەستەڵات نابێ ، پاکی و بێ گەردی و بەرزو بڵندی بۆ تۆیە پەروەردگارمان .

2ـ ( اللهم إني أعوذ برضاك من سخطك وأعوذ بمعافاتك من عقوبتك ، وأعوذ بك منك لا أحصي ثناء عليك ، أنت كما أثنيت على نفسك ) . واتي : خوایە پەنا دەگرم بەڕەزای تۆ لەخەشم و تورەیت وه پەنا ئەگرم بەلێ بووردەیت لەسزادانت و پەنا ئەگرم پێت ، ستایشم بۆت ژمارە ناکەم ، تۆ بەو جۆرەی کەخۆت وەسف و ستایشی خۆت کردووه .

3ـ (اللهم إياك نعبد ، ولك نُصلي ونسجد ، وإليك نسعى ونحفدُ ، نرجُو رحمتك ، ونخشى عذابك ، إن عذابك بالكافرين ملحق ، اللهم إنا نستعينك ، ونستغفرك ، ونثني عليك الخير ، ولا نكفرك ، ونؤمن بك ونخضع لك ، ونخلع من يكفرك ) . واته : خوایە تۆ دەپەرستین و بۆ تۆ نوێژدەکەین و کوڕنوش دەبەین ، وەبۆلای تۆ هەڵپە دەکەین و خێرایی دەکەین و ئومێدی بەزەیی تۆ دەکەین و لەسزاکەت دەترسین ، بەڕاستی سزاکەت بێ باواڕان دەگرێتەوه ، خوایە پشت بەتۆ دەبەستین و داوای لێ خۆشبوونت لێ دەکەین و ستایشی چاکی تۆ دەکەین و بێ باوەڕ نابین پێت و باوەڕت پێ دێنین و مل کەچین بۆت و دووره پەرێز دەوەستین لەو کەسەی کە بێ باوەڕە پێت و خۆمانی لێ دادەماڵین .

## ویردی دوای سلاودانەوەی نوێژی ویتر

پێغەمبەری خوا ( درودی خوای لێبێت ) لە نوێژی ویتردا سورەتی : ( سبح آسم ربک الاعلی ) وه ( قل یاأیها الکافرون ) و ( قل هو اللـه أحد ) ی دەخوێندو کە سلاوی دەدایەوه دەیفەرموو ( سبحان الملك القدوس ) سێ جار ، وه لەسێهەم جاردا دەنگی درێژدەکردەوه پێ ی و دەیفەرموو : ( رب الملائكة والروح ) ، واته : پاکی بۆ خوای پادشای پاک و بێ گەرد لەهەموو ناتەواوی یەک ، پەروەردگاری مەلائیکەتەکەن و ڕۆح .

## نوێژه سوننەتەکان

1ـ پێش نیوەڕۆ چوار ڕکات و لە پاشی یەوه چوار یان لە پێشیەوه دوو .

( هەرکەس پارێزکارێان بکات لەسەر ئاگری دۆزەخ حەرام دەکرێت لەوەی کە تێ ی بچێت ). ( أبو داود 55/2 و الترمذی 292/2 . وقال : حديث حسن غرين والنسائی265/3 وابن ماجه 367/1 وهو حديث صحيح )

2ـ چوار ڕکات پێش نوێژ عەسر ، ( ڕەحمەتی خوا لەو کەسە بێت لە پێش نوێژی عەسردا چوار ڕکات دەکات /ابو داود 295/2 وقال/غريب حسن .وهو حديث حسن انضر صحيح الترمذی /254 ) ... یان دوو ڕکات . ( البخاری_ رقم 601 البغا. و مسلم 1/ 573) .

3ـ دوو ڕکات پاش مەغریب و دوو ڕکات لە پێشی یەوە . ( پێغەمبەر درودی خوای لێبێت فەرمووی : ئەم دوو ڕکاتە لەماڵەوەتان بیکەن /ابن ماجه 368/1 وهو حديث حسن )

4ـ دوو ڕکات پاش عیشا وە ڕکات لە پێشی یەوە . ( مسلم504/1 ، البخاری601/البغا ، ومسلم 573/1 ) .

5ـ دوو ڕکات پێش بەیانی . ( سوننەتە لە یەکەم ڕکاتدا سورەتی (الكافرون) ولە دووەمدا (الاخلاص) بخوێندرێت) ...

( پێغەمبەر درودی خوای لێبێت هیچ نوێژێکی سوننەتی بە ئەندازەی ئەمە پارێزگاری نەدەکرد و بەردەوام نەدەبوو لەسەری . / البخاری45/3 ومسلم 501/1 ) وە پێغەمبەر درودی خوای لێبێت دەفەرمووێ : ئەم دوو ڕکاتە چاکترە لەدنیاو چی تێدایە/ رواه مشلم . صحيح الترغيب والترهيب 499/1 ) .

تێبێنی : سوننەتە دوای یەنجام دانی نوێژی سونەتی پێش بەیانی لەسەر لای ڕاست ڕابکشێت وەک پێغەمبەر درودی خوای لێبێت کردوویەتی / رواه البخاری 35/3 عن عائشه رضی الله عنها .

6ـ نوێژی چێشت هەنگاو ( الضحى ) : ( 2ـ 4ـ 6ـ 8 ) ڕکاتە .

باش وایە کە بە دوو دوو بیکەیت و کاتەکەی لە خۆربەرز بوونەوە بە ئەندازەی ڕمێک و ( چاکتر وایە کە ڕۆژگەرم دەبێت بکرێت ) تا کاتی لادانی خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان .

7ـ شەو نوێژ : لایەنە زۆرەکەی 13 ڕکاتە بە دوو ڕکاتی سوننەتی فەجرەوە ، بە رکاتێکی تاک کۆتایی پێ دێت . ( مسلم 509/1 . بەلاَم نوێژی تراويح 11 ڕکاتە / اخرجه الشيخان و غيرهما انظر صحيح أبی داود 1212 ) .

8ـ نوێژی ویتر : ( 1ـ 3ـ 5 ) تا ( 13 ) ڕکاتە . وە دوو دوو ڕکاتیش دواوەی. (كشف الستر عن ركعتين بعد الوتر ، لابن القيم(رحمه الله) ) .

9ـ سلاَوی مزگەوت ( تحية المسجد ) : دوو ڕکاتە کاتی چوونە مزگەوت پێش دانیشتن ئەنجام دەدرێت .

10ـ نوێژی داوای چاکە کردن ( الاستخارة ) : دوو ڕکاتە .

11ـ دوو ڕکات لە نێوان هەموو بانگ و قامەتێک دا .

12ـ نوێژی دوست نوێژ : دوای دەست نوێژ شتن ، دوو ڕکاتە .

( هەر کەسێک دەست نوێژی چاک بشوات وپاشان دوو ڕکات نوێژ بکات ولەگەڵ خۆیدا مەشغول نەبێت تیایدا خوای گەورە لە گەناهی لەوەو پێشی خۆش دەبێ / البخاری 266/1 ومسلم 573/1 )

13 ـ سوننەتی دوای نوێژی جمعە : چوار ڕكات لە مزگەوت ، یان دوو دوو ڕكات لە ماڵەوە . ( مسلم/ 881 وغیره عن ابی هریره رضی اللە عنه ) .

تێبینی : نوێژی سوننەتە ڕەواتیبە موئەكەدەكان ( 12 ) ڕكاتن ، پێغەمبەر درودی خوای لێبێت دەفەرموێت : ( هەر كەسێك بەردەوام بێت لەسەر دوانزە ڕكات نوێژی سوننەت لە ڕۆژدا خوای گەورە ماڵێكی لەبەهەشتدا بۆ دروست دەكات : چوار ڕكات پێش نیوەڕۆو دوو ڕكات لە دوایەوە و دوو ڕكات پاش مەغریب و دوو ڕكات دوای عیشاو دوو ڕكات پێش نوێژی بەیانی ) .
رواه الترمذی والنسائی وابن ماجه عن عائیشه ( رضی اللە عنها ) وقد صحح الحدیث الألبانی فی صحیح الجامع الصغیر ( 278/5 ) .

## نوێژی تەوبە ( ئەگەر گوناهێكی كرد )

( مامن عبد یذنب ذنبا فیحسن الطهور ، ثم یقوم فیصلی ركعتین ، ثم یستغفر اللّٰه إلا غفر اللّٰه له ) واتە : هیچ بەندەیەك نی یە كە گوناهێك دەكات ، چاك دەست نوێژ هەڵگرێ ، پاشان هەڵسێ و دوو ڕكات نوێژ بكات ، پاشان داوای لێ خۆش بوون لەخوا بكات ، ئیلا خوای گەورە لێی خۆش دەبێ .

## نوێژی دوو جەژنەكان ( ڕەمەزان و قوربان )

ئەم دوو نوێژە واجبە وە دوو ڕكاتە بەبێ بانگ و قامەت و بەبێ ( الصلاة جامعة ) دەكرێت ، لە ڕكاتی یەكەم دا پێش خوێندنی سورەتی ( الفاتحه ) حەوت تەكبیرات دەكرێ ، وە لە ڕكاتی دووەم دا پێنج تەكبیرات دەكرێ ، وە ذیكرێكی دیاری كراو نەهاتووە كە لە نێوان تەكبیرەكاندا بووترێ ، وە لەدوای نوێژو وتارێك دەخوێندرێتەوە ، وە سوننەتە خۆ گۆڕین و جلی نوێ لەبەر كردن و خۆبۆن خۆش كردن و دووركەوتنەوە بۆ نوێژگە ( المصلی ) بۆ ئەنجام دانی نوێژەكە مەگەر سەرمای زۆر نەهێڵێ وە گۆڕینی ڕێگای چوون و گەڕانەوە ، وە لە جەژنی ڕەمەزانیشدا سوننەت پێش دەرچوون بۆ نوێژ چەند دەنكە خورمایەك ( یان شتێك ) بخورێت ، وە دروستە دەف لێ بدرێت و سروود بوترێ لەلایەن كچۆڵەی باڵغ نەبوو بۆ دەرخستنی شادی و خۆشی تیایدا .
بڕوانە ( أحكام العیدین / علی حسن عبدالحمید الحلبی الاثری ... البخاری 350/952/949 ..ورواه مسلم 892/ .... وغیرهما عن عائشة خوا لێی رازی بێت )

## نوێژی خۆرو مانگ گیران ( الخسوف والكسوف )

ئەم نەێژە بە وتنی ( الصلاة جامعة ) خەڵکی بۆ کۆدەکرێتەوە وبانگ و قامەتی نی یە ، ، وە سوننەت وایە ئیمام دەنگ بەرز بکاتەوە تیایداو ڕاست ترین وەسفی دوو ڕکاتەو لەهەموو ڕکاتێک دا دوو چەمینەوە ( الركوع ) ی تێدایە ، وە لەنێوان چەمینەوەکاندا سورەتی ( الفاتحة ) دەخوێندرێتەوە ، وە سوننەتە لەوکاتەدا خێرو چاکە زۆر بکرێ وەک پاڕانەوەو تەکبیرات و خێرکردن و داوای لێخۆشبوون کردن لەخوای گەورە .... بەڵام تەپڵ و تەنەکەو دەف لێدان لەوکاتەدا داهێنراوو ( بدعة ) یەو لە خووڕەوشتی ماموسوڵمانانە .

## نوێژە بارانە ( صلاة الإستسقاء )

سوننەتە لەکاتی باران بارین دا بکرێت و ئەم نوێژە لە دەرەوەی شار ئەنجام دەدرێت و دووڕکاتەو لەدوایی دا ئیمام ووتارێک دەخوێنێتەوە.. کەتیایدا باسی یادی خواو هەڵنان دەکات بۆ گوێ ڕایەڵی کردنی خوای گەورەو سەرزەنشت کردنی یاخی بوون باس دەکات . وە ئیمام و ئەوانەی کە لە گەڵیدان زۆر داوای لێ خۆشبوون لەخوای گەورە دەکەن و دوپاڕێنەوە بۆ لاچوونی ئەم نەبارینی بارانە ، وە ئیمام پۆشاکەکەی هەڵدەگێڕێتەوەو بە هەڵگەڕاوەیی لەبەری دەکات .

## نوێژی نیازو داوای چاکە کردن لەخوای گەورە ( صلاة الإستخارة )

جابری کوڕی عبدالله ( ڕەزای خوای لێبێت ) دەفەرمووێت : پێغیمبەری خوا ( درودی خوای لێبێت ) داوای چاکە کردن ( الإستیخارة ) ی فێردەکردین کە لەهەموو کارکدا ئەنجامی بدەین ، هەروەکو چۆن سورەتێکی قوریانی فێر دەکردێن و دەیفەرموو : ئەگەر کەسێک لە ئێوە ویستی کارێک بکات ، با دوو ڕکات نوێژ بکات لەفەرزەکان ، پاشان با بپاڕێتەوەو بڵێ :

( اللهم إني أستخيرك بعلمك ، وأستقدرك بقدرتك ، وأسألك من فضلك العظيم فإنك تقدرُ ولا أقدرُ ، وتعلم ولا أعلم ، وأنت علام الغيوب ، اللهم إن كنت تعلم أن هذا الأمر _ ناوی پێویستی یەکەی دەهێنێ _ خير لي في ديني ومعاشي وعاقبة أمري — یان فەرمووی : عاجلة وآجله – فاقدره لي ويسره لي ، ثم بارك لي فيه ، وإن كنت تعلم

أن هذا الأمر شر في ديني ومعاشي وعاقبة أمري – يان فەرمووی: عاجله وآجله – فاصرفه عني واصرفني عنه ، واقدر لي الخير حيث كان ، ثم ارضني به ) .
واتە : خوایە من بە زانستی خۆت داوای خێرو چاکەت لێ دەکەم و داوای توانات لێ دەکەم بەتوانای خۆت ، وە لەفەزڵی گەورەت داوات لێ دەکەم ، بەڕاستی تۆ دەتوانی و من ناتوانم و زانای و من نازانم و تۆ زانای نهێنی و غەیبەکانی ، خوایە ئەگەر ئەم مەسەلەیە چاکەو خێری تیایە بۆ دین و ژیان و بژێوی کۆتایی تەمەنم ، یان ئێستاو کۆتایم ، ئەوا خوایە بەنسیبم بکەیت ئاسانی بکەیت لەسەرم و بەرەکەتی تێ بخە بۆم ، وە ئەگەر ئەم کارە خراپە بۆ دین و بژێوی و کۆتایی تەمەنم ، ئەوا خوایە لێم دوور بخەرەوەو منیش لەو دووربخەرەوەو خەیرو چاکەم بەنسیب بکە لە هەرشوێنێکەو پاشان دەروونم ڕازی بکە پێی .
وە پەشیمان نابێتەوە ئەوکەسەی داوای چاکەو خێر ( استخارة ) لە خوای گەورە بکات و ڕاوێژ بە بڕواداران بکات و لەکارەکەی بچەسپێ ، خوای گەورە دەفەرموێت : ( وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ ) / آل عمران ، واتە : مشۆرەت بە موسوڵمانان بکە لە مەسەلەداو ئەگەر لەسەر کارەکەت چەسپایت ئەوا پشت بەخوا ببەستە تیایدا .

## نوێژی ( صلاة التسبيح )

ئەم نوێژە چوار ڕکاتە و شێوەکەی کەمێک جیاوازی ناوەکی هەیە لەگەڵ نوێژەکانی تردا ، ئەویش بەم شێوەیە ئەنجام دەدرێت :
دوای تەکبەری نوێژ دابەستن سورەتی ( الفاتحة ) و سورەتێکی تر دەخوێنێت و پاشان هەر بە پێوە ( 15 ) جار دەڵێ (سبحان الله الحمد لله ولا إله إلا الله والله أكبر) پاشان دەچەمێتەوە ( 10 ) جار لە چەمینەوەدا دەیڵێیت ، ئینجا ڕاست دەبیتەوە لەچەمینەوەو ( 10 ) جار ئەم نزایە دەڵێیتەوە ، پاشان کوڕنوش دەبەیت و ( 10 ) جار دەیڵێیتەوە ، پاشان سەربەرز دەکەیتەوە ولە کوڕنوش و ( 10 ) جار دەیڵێیتەوە ، پاشان کوڕنوشی دووەم دەبەیت و ( 10 ) جار دەیڵێیتەوە ، پاشان سەرت لە کوڕنوش بەرز دەکەیتەوەو پێش هەستانەوە بۆ ڕکاتی دووەم ( 10 ) جار دەیڵێیتەوە ، بەهەمان شێوە ڕکاتەکانی تریش هەر ئاوەها ئەنجام دەدرێت ، واتە لەهەر ڕکاتێکدا ( 75 ) جار ئەو ذیکرە دووبارە دەکرێتەوە ، ئەگەر توانیت ڕۆژی جارێک ئەنجامی بدە ، ئەگەر نا هەفتەی جارێک ، ئەگەر نەت توانی مانگی جارێک ئەگەر نا ساڵی جارێک ، ئەگەر توانات نەبوو لەتەمەنت دا جارێک ئەنجامی بدە .

سوننەتەکانی ڕۆژی هەینی ( الجمعة )
1ـ زووهاتن بۆ مزگەوت .
2ـ خۆشتن (کە سوننەتێکی موئەکەدەیە و هەندێ لە زانایان پێ یان واجبە ) وە خۆ بۆن خۆش کردن و سەرچەورکردن بە زویت .
3ـ پۆشینی پۆشاکی نوێ .
4ـ نزیک بوونەوە لە ئیمام .
5ـ خوێندنی سورەتی ( الکهف ) : هەرکەسێ ڕۆژی هەینی سورەتی ( الکهف ) بخوێنێ نورێکی بۆ دادەگیرسێ بە ئەندازەی نێوان هەردوو جومعەکە ( صغیر الجامع الصغیر ) .
6ـ زۆر صڵاوات دان لە پێغەمبەرە( خوا درودی خوای لێبێت) تیایدا .

## نزاو پاڕانەوەی دڵ تەنگی و خەفەت

1ـ هەرگیز هیچ کەسێک نی یە کە تووشی ناخۆشی و خەفەتێک دەبێت و بڵێت : ( ... ئەم دوعایەی خوارەوە) ئیلا خوای گەورە غەم و خەفەتەکەی لادەبات و شوێنەکەی پڕدەکاتەوە بە دەرو لێ کردنەوە و دڵ خۆشی و کامەرانی ، ووتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ئایا لەبەری نەکەین ؟ فەرمووی : بەڵێ پێویستە هەر کەسێک دەیبیستێت لەبەری بکات ...

( اللهم إني عبدك ابن عبدك ابن أمتك ناصيتي بيدك،ماضٍ في حكمك ، عدل في قضاؤك ،أسألك بكل اسم هو لك سميت به نفسك أو أنزلته في كتابك ، أو علمته أحداً من خلقك أو استأثرت به في علم الغيب عندك أن تجعل القرآن ربيع قلبي ، ونور صدري ،وجلاء حزني وذهاب همي ) .

واتە : خوایە من بەندەتم کوڕی بەندەتم کوڕی کەنیزەیەک و کۆیلەکەتم ، نسیب و ناوچەوان و چارەنەسم بەدەست تۆیەو حوکم و بڕیارت بەسەرمدا ڕابووردووە ، بڕیاردانت بەسەرم دا دادپەروەرانەیە ، داوات لێ دەکەم بەهەموو ناوێک کە هەتەو خۆتت پێ ناوناوە ، یان لە کتێبەکەت دا ناردووتەتە خوارەوە ، یان فێری یەکێک لە دروست کراوەکانت کردووە ، یان عیلمی غەیبدا لە لای خۆت هەڵت گرتووەو تەنها خۆت دەیزانی ، کە قورئان بکەیتە بەهاری دڵم و نوری سنگم و ڕەوێنەرەوەی دڵ تەنگیم و لابەری خەم و خەفەتم .

2ـ پێغەمبەر درودی خوای لێبێت زۆر ئەم دوعایەی دەکرد :

( اللهم إني أعوذ بك من الهم والحزن ، والعجز والكسل والبخل والجبن ، وضلع الدين وغلبة الرجال ) ، واته : خوایه پەنات پێ ئەگرم لە دڵ تەنگی و خەفەت ، وە لە بێ دەسەڵاتی و بێ توانایی و تەمبەڵی ، وە لە بەخیلی و ترسنۆکی ، وە لە پشت چەمانەوە بەهۆی قورزاریەوەو لە دۆڕانی پیاوانی ئیسلام و ژێرکەوتنیان .

## نزاو پاڕانەوەی کاتی تەنگانەو سەخڵەتی ( الكرب )

1 ـ ( لا إله إلا الله العظيم الحليم ، لا إله إلا الله رب العرش العظيم ، لا إله إلا الله رب السموات ورب العرش الكريم ) .

واته : هیچ پەرستراوێک نی یە بەهەق جگە لا ( اللە ) ی مەزنی خاوەن حیلم و هێدی ، هیچ پەرستراوێک نی یە بە هەق جگە لە پاروەردگاری عەرشی گەورە ، هیچ پەرستراوێک نی یە بە هەق جگە لە پاروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و پەروەردگاری عەرشی بەڕێز .

ئەمە نزاو پاڕانەوەی یونس پێغەمبەرە (عليه الصلاة والسلام ) بوو کە لە سکی حوتەکەدا کردی ، هیچ موسوڵمانێک نی یە کە بیلێ ئیلا وەڵام دەدرێتەوە .

2 ـ ( لا إله إلا أنت سبحانك إني كنت من الظالمين ) واته : هیچ پەرستراوێک نی یە بەهەق جگە لە تۆ ، خوایە پاکی و بێ گەردی بۆ تۆیە ، بەڕاستی من لە ستەم کارانم و ستەمم لەخۆم کردووە .

3 ـ ( الله الله ربي لا أشرك به شيئاً ) ، واته : (اللە) (اللە) پەروەردگارمە هیچ هاوبەشێکی بۆ دانانێم .

4 ـ ( اللهم رحمتك أرجو فلا تكلني إلى نفسي طرفة عين ِ وأصلح لي شأني كله لا إله إلا أنت ) ، واته : خوایە ئومێدی ڕەحمەتت دەکەم بۆ ئەندازەی چاوتروکانێک مەمدەرە دەست نەفسم و هەموو کاروبارم چاک بکە ، هیچ پەرستراوێک نی یە بەهەق جگە لەتۆ .

5 ـ ( يا حي يا قيوم برحمتک أستغيث ) واته : ئەی خوای زیندوو ئەی هەڵسوڕێنەری بوونەوەر هاناو هاوار بۆلای ڕەحمەتی تۆ دەبەم .

## لەکاتی بەرەنگاربوونەوەی دوژمن وخاوەن دەسەڵات دا

1ـ ( اللهم إنا نجعلك في نحورهم ونعوذ بك من شرورهم ) ، واتـه : خوايه تۆت بچۆ بـەگژیانداو پەنادەکرم بـەتۆ لـه شەڕو خراپەکانیان .

2ـ ( اللهم أنت عضدي وأنت نصيري ،بك أجول ،وبك أصول ، وبك أُقاتل ) ، واتـه : خوایه تۆ کۆمەک و تۆ پشتیوان و سەرخەمی ، بـەتۆوە ئـەجوڵێم و بـه تۆوە هەڵمەت ئـەبەم و بـەتۆوە ئـەجەنگم و کوشتار دەکەم .

3ـ (حسبنا الله ونعم الوكيل ) ، واتـه : خوامان بـەسەو چاکترین کاری پێ سپێردراوە .

## نزاو پاڕانـەوەی کـەسێک کـه لـەستەمی خـاوەن دەستـەڵاتێک بترسێ

1ـ ( اللهم رب السموات السبع ،ورب العرش العظيم ،كن لي جاراً من فلان بن فلان ، وأحزابه من خلائقك ؛ أن يفرط على أحد منهم أو يطغى ، عز جارك ،وجل ثناؤك ،ولا إله إلا أنت ) ، واتـه : خوایه پەروەردگاری حەوت ئاسمانـەکان و پەروەردگاری عەرشی مەزن ، پشتیوانم بـه دژی فلانـی کوڕی فلام و پارت و کۆمەڵەکەی لـه دروست کراوەکانت ، لـەوەی کـەیەکێکیان زاڵ ببن بـەسەرمدا یان دەستم لـێ بێننـەوە ، بـەهێزە پشتیوانێت بۆ خـەڵکی و هـەر کـەس پەنات پێ بگرێت شکۆمەندە و شکۆمەندە و ستایشت پیرۆزو دیارەو هیچ پەرستراوێک نـی یـه بـەهەق جگـه لـەتۆ .

2ـ ( الله أكبر، الله أعز من خلقه جميعاً ، الله أعز مما أخاف وأحذر ،أعوذ بالله الذي لا إله إلا هو ، المسك السموات السبع أن يقعن على الأرض إلا بإذنه ،من شر عبدك فلان ،وجنوده وأتباعه وأشياعه ، من الجن والأنس ، اللهم كن لي جاراً من شرهم ، جل ثناؤك وعز جارك ، وتبارك اسمك ، ولا إله غيرك ) . سێ جار ،
واتـه : خوا گـەورەیە ، خوا لـەهەموو دروست کراوەکانی دەسەڵاتدارترەو شکۆمهندترە ، خوا دەسەڵاتدارترا لـەهەموو ئـەوەی کـه لێی دەترسم و سڵـی دەکـەمەوە ، پـەنا دەگرم بـەو خوایەی کـه پەرستراوی تر نـی یه بـەهەق جگـه لـەو ، ڕاگیرکەری حەوت ئاسمانـەکان تانـەکەون بـەسەر زەوی دا بـەئیزنی خۆی ، خراپەی فلانـی بـەندەت و سەربازو شوێن کـەوتـەو کۆمەڵـەکانی لـەجنۆکـەو مرۆڤ ، خوایە پشتیوانم بـه لـه خراپەیان ، ستایشت پیرۆزو دیارەو ئـەو کـەسەی پـەنات بۆ دێنـێ شکۆمەندەو ناوت بـەرزو پیرۆزەو هیچ پەرستراوێک نـی یه بـەهەق جگـه لـەتۆ .

## نزاو پاڕانەوە لە دوژمن

( اللهم منزل الكتاب ، سريع الحساب ،اهزم الأحزاب ،اللهم اهزمهم وزلزلهم ) .
واتە : خوایە دابەزێنەری قوریان ، حیسابت خێرایە ، حیزب و کۆمەڵە بێ باوەڕەکان بشکێنە ، خوایە شکستیان پێ بهێنەو جێ پێیان لەق بکەو ڕاچەمانیان تێ بخە .

## ئەگەر لەکۆمەڵێک ترسایت

( اللهم اكفنيهم بما شئت ) ، واتە : خوایە بەهەر شتێک تۆ ویستت لێ یەتی لەناویان بەرەو کۆتایی پێ بێنە .
ئەمە ووتەی منالەکەی ( أصحان الأخدود ) ە کە لەبێ باوەرەکانی کرد .

## لەسەرەمەرگی شەهیدی دا

بلێ : (الله أكبر ، فزت ورب الكعبة ) ، واتە : خوا گەورەیە ، بە پەروەردگاری کەعبە بردمەوە .

## لەکاتی پەیدا بوونی گومان لە ئیمان دا

1ـ پەنا دەگرێ بە خوای گەورە .
2ـ کۆتایی لەو شتە دێنێ کە گومانی هەیە تیایدا .
3ـ بلێ ( آمنت بالله ورسله ) واتە : ئیمانم هێنا بە خواو پێغەمبەرەکانی ( عليه الصلاة والسلام ) .
4ـ ئەم ئایەتە دەخوێنێتەوە : ( هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ) ، واتە : خوایە یەکەمین و دوایەمین و زاڵە بەسەر هەموو شتێک دا بەزانستی و پەنهانە بەسەر هەموو شتێک دا بە زانستی و بە هەموو شتێک ئاگادارەو زانایە .

## نزاو پارانەوەی قەرزاری

1ـ ( اللهم اكفني بحلالك عن حرامك ، وأغنني بفضلك عن سواك ) .
واتە : خوایە بە حەلالی خۆت تێرم بکەو بێ نیازم بکە لەحەرامت تا مەجبوری نەبم و بە فەزلی خۆت دەولەمەندو بێ نیازم بکە لەغەغەیری خۆت .

هەر کەسێک ئەمە بڵێ و بە ئەندازەی شاخی ( صبیر ) قەرزار بێت ، خوای گەورە دانەوەی بۆ یاسان دەکات . / الترمذي 560/5 وحسنه الألبانئ في صحيح الجامع( 2625 )

2ـ ( اللهم إني أعوذ بك من الهم والحزن ، والعجز والكسل ،والبخل والجبن وضلع الدين وغلبة الرجال ) .

واتە خوایە پەنات پێ ئەگرم لەدڵ تەنگی و خەفەت . وە لە بێ دەسەڵاتی و تەمبەڵی . وە لە بەخیلی و ترسنۆکی . وە لە پشت چەمانەوە بەهۆی قەرزاری یەوەو لە دۆڕانی پیاوانی ئیسلام و شکست هێنانیان .

## ئەگەر کارێکت لەسەر گران بوو

( اللهم لا سهل إلا ما جعلته سهلاً وأنت تجعل الحزن إذا شئت سهلاً ) .

واتە : خوایە هیچ کارێکی ئاسان نیە مەگەر ئەوەی تۆ ئاسانت کردووە ، وە تۆ ئەگەر وویستت لێ بێ زبری و ڕەقی و گرانی زەوی ئاسان دەکەیت .

ئەو نزایەی کە شەیطان و دوو دڵی یەکانی ڕاودونێ

1ـ پەنا گرتن بە خوای گەورە لێی .

2ـ بانگ دان .

3ـ ذیکرە شەرعی یەکان و خوێندنەوەی قورئان .

( ماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕستان ، بەڕاستی شەیطان لەو ماڵە ڕادەکات کە سورەتی ( البقرة ) ی تێدا دەخوێندرێ ) ، مسلم / 539 .

وە لەو نزایانەی کە شەیطان ڕاودەنێ : ذیکری بەیانیان و ئێواران و خەوتن و هەستان لەخەوو ذیکری چوونەماڵ و هاتنە دەرەوە لێی و ذیکری چوونە مزگەوت و هاتنە دەرەوە لێی و غەیری ئەمانە لە ذیکرە شەرعیەکان وەکو خوێندنی ( آية الكرسي ) لە پێش خەوتنداو خوێندنی دووئایەتی کۆتایی سورەتی ( البقرة ) . وەهەر کەسێک (سەد) جار بڵێ ( لآ إلە الا اللە وحدە لا شریک لە لە الملک ولە الحمد وهو علی کل شئ قدیر ) ئەوا دەبێتە قەڵغان بۆی لە شیطان بەدرێژایی ئەو ڕۆژە . وە هەروەها بانگ دان شەیطان ڕاودەنێ .

## ئەگەر کارێکت ویست و سەری نەگرتو وادەرنەچوو

بڕواداری بەهێز چاکترەو خۆشەویست ترە بە لای خوای گەورەوە لە بڕواداری لاوازو لە هەموو چاکەیەکدا ، سوور بە لەسەر ئەو شتەی کەڵکت پێ

دەگەیەنێ و پشت بەخوا ببەستەو دەستەوسان و لاواز مەبە ، وا ئەگەر شتێکت تووش هات مەڵێ : ئەگەر ئاواو ئاوام بکردایە ئاواو ئاوا دەبوو بەڵکو بڵێ : ( قدر الله وما شاء فعل ) .. واتە : بڕیاری خوای گەورەو ئەو شتەی ویستی بوو کردی و ئەنجامی دا ، چونکە ووشەی ( ئەگەر ) دەرگای کاری شیطان دەکاتەوە )

## لەکاتی پژمین دا

1ـ دەست یان کراسەکات بخەرە سەر دەمت و دەنگت نزم بکەرەوە .
2ـ ئەگەر یەکێک لە ئێوە پژمی با بڵێ : ( الحمد لله ) یان (الحمد لله على كل حال ) . واتە : سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە لەسەر هەموو حالێک وە با براکەی یان هاوەڵەکەی پێی بڵێ : ( يرحمك الله ) واتە : خوا ڕەحمت پێ بکات ، وا ئەگەر وتی : ( يرحمك الله ) ئەم پێی بڵێ : (يهديكم الله ويصلح بالكم) واتە : خوا ڕێنمایتان بکات و حاڵتان بۆ چاک بکات .
3ـ ( ئەگەر کەسێک لە ئێوە پژمی و سوپاسی خوای کردو بیستتان (هەمووتان) وەڵامی بدەنەوە بە (يرحمك الله) بەڵام ئەگەر سوپاسی خوای نەکرد وەڵامی مەدەنەوە ) .
تێبینی : هاتا سێ جار وەڵامی کەسێک بدەرەوە کە پژمی بە (يرحمك الله) ، ئەگەر زیاد لە سێ جار پژمی وەڵامی مەدەرەوە.
ئەگار بێ باوەڕێک پژمی : و ( الحمد لله ) ی کرد : پێی بڵێ : ( يهديكم الله ويصلح بالكم ) .

لاکاتی باوێشک دان دا
1ـ باوێشک لە شەیطانەوەیە ، ئەگەر باوشکت هات تا دەتوانی بیگێڕەوە چونکە شەیطان لەوکاتەدا پێت پێ دەکەنێت .
2ـ ئەگەر باوێشکت دا دەست بخەرە سەردەمت چوبکە شەیطان دەچێتە ناوی .

## نزاو پاڕانەوەی بۆ موسوڵمانێک ئەگەر هاوسەری هێنا (داوای مارە بڕین )

1 ـ پێی بڵێ : ( بارك الله لك ، وبارك عليك ، وجمع بينكما في خير ) ، واته : خوا لێت پیرۆز بکات و بەرەکەت برژێ بەسەرت داو لەسەر خێر کۆتان بکاتەوە .

2 ـ یان بڵێ : ( اللهم بارک فيها وبارک لهما في بنائهما ) ، واته : خوایە بەرەکەت برژە بە سەریانداو بەرەکەت بخەرە نەوەکانیانەوە .

2 ـ یان بڵێ : (على الخير والبركة و علي خير طائر ) ، واته : لەخوا دەپارێمەوە لەسەر چاکەو فەڕو پیرۆزی بێت و لەسەر نسیبێکی چاک کۆی کردبێتنەوە .

## نزاو پاڕانەوەی ژن هێنەرو بکڕی هۆی گواستنەوە

( ئەگەر یەکێک لە ئێوە ژنی هێناو خێزانی پەیدا کرد ، یان خزمەت کاری کری ، با نیوچەوانی بگرێ و بڵێ : ( اللهم إني أسألك خيرها وخير ما جبلتها عليه وأعوذ بك من شرها وشر ما جبلتها عليه ) .

واته : خوایە من داوای چاکەی ئەمەو ئەو چاکەیەت لێ دەکەم کە خستوتە سەری و پەنات پێ ئەگرم لە خراپەکەی و لەو خراپەیەی کە خستوتەتە سەری ، وە ئەگەر حوشترێکی کڕی با دەست بگرێ بە پێشی سەریەوەو هەروەکو ئەمە بڵێ ) .

## نزاو پاڕانەوەی پێش چوونە لای خێزان و ( جیماع کردن )

( بسم الله ، اللهم جنبنا الشيطان وجنب الشيطان ما رزقتنا )

واته : بەناوی خوا ، خوایە شەیطانمان لێ دوور بخەرەوەو شەیطان لەو منداڵەش دوور بخەرەوە کە پێمان دەبەخشی .

( ئەگەر ئەمە بڵێ و منداڵیان بوو ئەوا شەیطان هەرگیز ناتوانێ زیانی پێ بگەیەنێ ) البخاري 141/6 ومسلم 1028/5

## ئەگەر منداڵتان بوو

1 ـ هۆزەبان ( العقيقة ) ی بۆ بکە ، ئەویش سەربڕینی دوو مەڕە بۆ نێرو یەک مەڕ بۆ منداڵی مێ ینە .

2 ـ ئەمە لە ڕۆژی حەوتەم دا دەکرێت و منداڵەکە ناو دەنرێت بە ناوێکی جوانی شەرعی ئەگەر نەکرا ئەتوانی لە 14 یان 21 دا بکرێ .

3 ـ وە گۆش (تحميک) دەکرێت ، ئەویش بە خورمایەک لە دەمی خۆت دا شلی بکەرەوەو بیدە لەمەلاشووری و دوعای خێری بۆ بکە .

( ئەبو ئەنەس دەفەرموویت : منداڵێکمان بوو بردم بۆ لای پێغەمبەر درودی خوای لێبێت و ئەویش ناوی نا ئیبراهیم و خورمایەکی لەدەمی خۆی دا شل

کردەوەو دەمی منداڵەکەی پێ شیرین کرد و پاڕایەوە بۆی بە بەرەکەت و دایەوە پێم ) .
4ـ وە سەری دەتاشرێ و بە ئەندازەی کێشەکەی زیو دەبەخشیتەوە بەسەر هەژاران دا .
ئەو نزاو پاڕانەوەی کە منداڵی پێ پەنا دەدرێ
ابن عباس ڕەزای خوایان لێبێت فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا درودی خوای لێبێت حەسەن و حوسەینی پانا دەدات بەمە : ( أعيذكما بكلمات الله التامة ، من كل شيطان وهامة ، وكل عينٍ لامة ) ، واتە : پەناتان دەدەم بە ووشە تەواوەکانی خوای گەورە ، لە هەموو شەیطان و گیانلەبەرو زیندەوەرێکی زیانبەخشی خاوەن ژەهر ، ولەهەموو چاوێکی لۆمەکراوو پیس . ( یان : و من كل عينٍ لامة ، واتە : لە هەموو دەردو نەخۆشی یەک کە مرۆڤ دەیگرێ لە شێتی و کەم عقڵی ) . وە دەیفەرموو : ئەمە ئیبراهیم پێغەمبەر ( عليه الصلاة والسلام ) ئیسماعیل و ئیسحاقی کوری پێ پەنا دەدا.

## فەزڵی سەردانی کردنی نەخۆش

پێغەنبەری خوا درووی خوای لێبێت دەفەرموویت : ( إذا عاد الرجل أخاه المسلم مشى في خرافة الجنة حتى يجلس فإذا جلس غمرته الرحمة ، فإن كان غدوة صلى عليه سبعون ألف ملك حتى يمسي ، وإن كان مساء صلى عليه سبعون ألف ملك حتى يصبح )
واتە : ئەگەر پیاوێک سەردانی برا موسوڵمانەکەی بکات و نەخۆشی یەکەی بەسەر بکاتەوە ئەوا بەناو باخێکی میوەی بەهەشت دا داڕوات هەتا دادەنیشێ ، وەکاتێ دانیشت بەزەیی خوایی دای دەپۆشێت و دای دەگرێتەوە ، وە ئەگەر بەیانی بێت حەفتا هەزار مەلائیکەت بۆی دەپاڕێنەوە هەتا ئێوارەی لێ دەبیتەوە ، وەئەگەر ئێوارە بێت حەفتە هەزار مەلائیکەت بۆی دەپاڕێنەوە هەتا بەیانی لێ دەبێتەوە .

## نزاو پاڕانەوە بۆ نەخۆش لەکاتی سەردانی کردنی دا

1ـ پێغەمبەری خوا درودی خوای لێبێت ئەگەر بچوایە بۆ دەردانی نەخۆشێک پێی دەفەرموو : ( لا بأس طهور إن شاء الله ) واتە : هیچ نی یە پاک دەبیتەوە لە گوناە بە ویستی خوای گەورە .
2ـ ( هیچ بەندەیەکی موسوڵمان نی یە کە سەردانی نەخۆشێک بکات کە ئەجەلی نەهاتبێ و حەوت جار بڵێ : ( أسأل الله العظيم رب العرش العظيم أن

يشفيك) ئيلا چاك دەبێتەوە . واتە : داوا ئەكەم لە خوای مەزنی پەروەردگاری عەرشی مەزن کە شیفات بدات .

3ـ ( اللهم آشف عبدک ينكا لک عدوا ، أو يمشي لک إلي جنازة ) واتە : خوایە شیفای بەندەکەت بدە تا دوژمنت بۆر بدات ( بەوەی زۆریان لێ بریندارو کوژراو بخات ) یان لەبەر تۆ بچێت بە دوای جانازەیەکداو شوێنی بکەوێ .

4ـ ( بسم الله أرقيک ، من كل شئ يؤذيک ، ومن شر كل نفس أو عين حاسد الله يشفيك ، بسم الله أرقيک ) واتە : بەناوی خواوە دوعات بۆ دەکەم لە هەموو شتێک کە ئەزیەتت دەدات و لەخراپەی هەموو نەفسێک یان چاوی حەسوود بەرێک کە حەسودیت پێ دەبات خوا شیفات بدات ، بەناوی خواوە دوعات بۆ دەکەم .

5ـ ( اللهم رب الناس ، أذهب البأس واشف أنت الشافي ، لا شفاء إلا شفاءک ، شيفاء لا يغادر سقما ) ، واتە : خوایە پەروەردگاری خوڵکی ، ئەم ئازارە لابەرە و شیفای بدە ، خۆت شیفا دەری دەردانی ، هیچ شیفایەک نی یە جگە لە شیفای تۆ ، شیفایەک کە هیچ نەخۆشی یەک جێ ناهێڵێ .

## نزاو پاڕانەوەی ئەو نەخۆشەی دەستی لە ژیان شتووەو بێزار بووە

1ـ ( اللهم اغفر لي وارحمني والحقني بالرفيق الأعلى ) ، واتە : خوایە لێم خۆش بەو ڕەحمم پێ بکەو بمگەیەنە بە هاوڕێ یانی پلە بەرز .
( کە بریتین لە پێغەمبەران ( عليهم الصلاة والسلام ) و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاو چاکان ، بڕوانە سورەتی ( النساء 69 ) وە بڕوانە ( قصص الانبياء ) ی ابن كثير لاپەرە (310 .

2ـ لو عائیشەوە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی : پێغەمبەر درودی خوای لێبێت لەکاتی سەرەمەرگی دا هەردوو دەستی دەخستە ناو ئاوەوەودەیسرین بەدەمووچاوی داو دەیفەرموو (لا إله إلا الله إن للموت لسكرات) ، واتە : هیچ پەرستراوێک نی یە بەهەق جگە لە (الله) بە ڕاستی مردن ژان و نارەحەتی خۆی هەیە .

3ـ ( لا إله إلا الله والله أكبر ، لا إله إلا الله وحده ، لا إله إلا الله لا شريك لهُ ، لا إله إلا الله لهُ الملك ولهُ الحمد ، لا إله إلا الله ولا حول ولا قوة إلا بالله ) ، واتە : هیچ

پەرستراوێک نی یە جگە لە (الله) و خوا گەورەیە هیچ پەرستراوێک نی یە بەهەق جگە لە (الله) و تاکە ، هیچ پەرستراوێک نی یە بەهەق جگە لە (الله) و تاک و بێ هاوبەشە ، هیچ پەرستراوێک نی یە بەهەق جگە لە (الله) و موڵک و ستایش بۆ ئەوە هیچ پەرستراوێک نی یە بەهەق جگە لە (الله) و گۆڕان و توانا نی یە مەگەر بەوەوە .

## تەڵقین دادانی کەسێک کە لەسەرەمەرگ دا بێت

( من كان آخر كلامه لا إله إلا الله دخل الجنة ) واتە : هەر کەسێک کۆتا ووتەی لە دونیا دا ( لا إله إلا الله ) بێت دەچێتە بەهەشتەوە .

## ئەگەر تووشی موسیبەتێک بوو (کەسێکی مرد)

1ـ ( إنا لله وإنا إليه راجعون اللهم أجرني في مصيبتي وأخلف لي خيراً منها ) واتە : ئێمە موڵکی خواین و بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە ، خوایە پاداشتم بدەیتەوە لەم موسیبەتەمداو کەسێکی باشترم بۆ بخەرە جێگەی .
( هیچ موسوڵمانێک نی یە کە موسیبەتێکی ئاوای تووش ببێ و وەک ئەوەی خوای گەورە کەسێکی چاکتری لە پاش ئەو بۆ دەخاتە شوێنی) مسلم 632/2
2ـ یان بڵێ : ( اللهم اغفر لي وله ، وأعقبني منه عقبة حسنة ) واتە : خوایە لە من و لە ئەویش (مردووەکە) خۆش ببەو کەسێکی چاکم بۆ بخەرەوە شوێنی .

## لەکاتی داخستنی چاوی مردوویەک دا

( اللهم اغفر لفلان (ناوەکەی دەڵێی) ورفع درجته في المهديين، واخلفه في عقبه في الغابرين، واغفر لنا وله يا رب العالمين ،وافسح له في قبره ونور له فيه ) ، واتە : خوایە لو فلانەکەس خۆش ببەو پلەی بەرزبکەرەوە لە ناو ڕێنمویی کراواندا لە پاش ئەو کەسێکی دڵسۆز جێ بهێڵە بۆ کەس و کاری وبیکەرە جێ نشینی ، وە لە ئێمەو لەویش خۆش ببە ئەی پەروەردگاری جیهانیان و گۆڕەکەی بۆ فراوان بکەو بۆی ڕۆشن و نوردار بکە .

## ئاوات نەخواستنی مردن

هیچ کەسێک لە ئێوە ئاواتی مردن نەخوازێ (بەهۆی نارەحەتی یەوە کە تووشی هاتووە) ، ئەگەر هەرد دەبوو بیلێ با بڵێ : (اللهم أحييني ما كانت الحياة

خيرا لي ، وتوفني إذا كانت الوفاة خيرا لي ) واته : خوايه بمژێنه هەتا ئەو كاتەی ژیان چاكە بۆم و بممرێنە ئەگەر مردن خێری تێدا بوو بۆم .
( دروست نی یه موسوڵمان ئاواتی مردن بخوازێ ، لەبەر ئەوەی چاكترین كەس ئەو كەسەیە كە تەمەنی درێژ بێت و كرداری چاكی زۆر بێت ، وە تا گوناه كەم بكاتەوەو پەشیمان ببێتەوە لێی ، هەروەها لەبەر سەختی و نارەحەتی مردن و ژیانی ناو گۆڕ ، بەڵام ئەگەر موسوڵمان لە دین و ئیمانی ترسی هەبوو كەزیانی پێ بگات لەكاتی زۆربوونی فیتنەو ئاشووبەدا ، ئەوا ئەو كاتە دروستە ئاواتی مردن بخوازێت تا ژیانی كۆتایی پێ بێت بەڵام دینی سەلامەت بێت .

## نوێژی مردوو

نوێژی مردوو فەرزی كیفایەیە (واتە ئەگەر چەند كەسێك ئەنجامی بدەن لەسەر موسوڵمانانی ئەو ناوچەیە گوناهبار دەبن) وە ئەم نوێژە كوڕنوش و چەمینەوەی تێدا نی یه ، ڕاسترین شێوەی چوار تەكبیر ( الله أكبر ) ە ، وە پێج تەكبیر تا نۆ تەكبیر كردن هاتووە . وە ئەصڵ وەهایە تەنها لە تەكبیری یەكەمی نوێژ دابەستندا دەست بەرز بكرێتەوە .
ڕوو بە (قیبلە) دەوەستێت و مردووەكە لەبەردەم خۆیدا دادەنێ و ئەگەر مردووەكە پیاو بوو لەلای سەری یەوەو ئەگەر ئافرەت بوو لەلای ناوەراستی دا دەوەستێو تەكبیری دابەستن دەكاو دەست بەرز دەكاتەوەو پاشان دەست دەگرێ و سورەتی (الفاتحة) و سورەتێكی تر دەخوێنێت بەبێ دوعای دەست پێكردن (الإستفتاح) ، وە تەكبیری دووەم دەكات و صڵاوات دەدات لەسەر پێغەمبەر درودی خوای لێبێت .
وە لەدوای تەكبیری سێ یەم و چوارەم و ....هتد ، دەپاڕێتەوە بۆ مردووەكە بەو پاڕانەوەی كە ئێستا پێ ی دەگەین ، وە بەدەنگی نزم ئەم نوێژە دەكرێت ئەگەر ئیمام بوو ، مەگەر لەبەر فێركردی خەڵكەكە دەنگ بەرز بكاتەوەو سڵاویش دەداتەوە هەر بە دەنگی نزم بە جۆرێك تەنها دوای خۆی ببیستن و بە یەک سڵاویش دەتوانێت سڵاو بداتەوە (واتە بە یەک لادا) ، بەڵام لە سێ كاتدا ئەم نوێژە دروست نی یه مەگەر لەبەر ناچاری : ( كاتێ خۆر هەڵدێ تا بەرز دەبێتەوە بە تەواوی ) وە ( كاتێك خۆر دەچێتە ناواڕاستی ئاسمان لادەدات ) وە ( كاتێك خۆر سەر دەبات بۆ ئاوا بوون تا یاوا دەبێت) وە هەتا نوێژكەران لەسەری زۆربن چاكترە ، لەو فەرموودانەش كەباسی ئەمە دەكات : پێغەمبەر درووی خوای لێبێت دەفەرموێت : ( هەر پیاوێكی موسوڵمان

بمرێت و لەسەر جەنازەکەی چل پیاوی یەکتاپەرست بوەستن کە هاوەڵیان هیچ بۆ خوا دانەنابێ ، ئیلا خوای گەورە تکایان وەردەگرێت )
وە دەفەرموێت درودی خوای لێبێت : ( هەر کەسێک سێ ڕیز لە خەڵکی لەسەری نوێژ بکات ، بەهەشتی بۆ واجب دەبێت ) .

## پارانەوە بۆ مردوو لە نوێژە مردوودا

1ـ ( اللهم اغفر له وارحمه، وعافه ،واعف عنه ،وأكرم نُزُله ، ووسع مُدخلهُ ، واغسله بالماء والثلج والبرد ، ونقه من الخطايا كما ينقى الثوب الأبيض من الدنس ، وأبدله داراً خيراً من داره ، وأهلاً خيراً من أهله وزوجاً خيراً من زوجه، وأدخله الجنة ،وأعذه من عذاب القبر ( ومن عذاب النار ) ، ) .

واتە : خوایە لێی خۆش ببەو ڕەحمی پێ بکەو بی پارێزەو لێی ببورەو لەشوێنگەیەکی خۆش و بەڕێزدا داینێ و شوێنەکەی بۆ فراوان بکەو بەئاوی باران وبەفرو تەرزە بیشۆرەو لە گوناه پاکی بکەنەوە هەروەک چۆن پۆشاکی سپی پاک دەبێتەوە لە چڵک ، وەماڵەکەی بۆ بگۆڕە بەخانەیەکی خۆش ترو کەس وکارێکی بدەرێ لەکەس وکارەکەی چاکترو خێزانێکی بدەرێ لە خێزانەکەی باشترو بیخەرە بەهەشتەوەو پەنای بدە لە سزای گۆڕو سزای ئاگری دۆزەخ .

2ـ ( اللهم اغفر لحينا وميتنا ، وشاهدنا وغائبنا ، وصغيرنا وكبيرنا ، وذكرنا وأُنثانا ، اللهم من أحييته منا فأحيه على الإسلام ، ومن توفيته منا فتوفه على الإيمان ، اللهم لا تحرمنا أجره ولا تضلنا بعده ) .

واتە : خوایە خۆش ببە لە زیندووو مردوومان و لە ئامادەو نا ئامادەمان و بچووک و گەورەمان و نێرو مێ مان ، خوایە هەر کەسێکمانت ژیاند لەسەر ئیسلام بیژێنەو هەرکەسێکمانت مراند لەسەر ئیسلام بیمرێنە ، خوایە لە پاداشتی ئەم موسیبەتە بێ بەشمان مەکەو لەدوای ئەم کەسە سەرلێ شێواوو گومڕامان مەکە .

3ـ ( اللهم إن فلان بن فلان في ذمتك،وحبل جوارك،فقه من فتنة القبر وعذاب النار،وأنت أهل الوفاء والحق .فاغفر له وارحمهُ إنك أنت الغفور الرحيم ) .

واتە : خوایە فلانی کوری فلانم لە ژێر پارێزگاری تۆدایەو لو ژێر چاودێری و دەسەڵاتی تۆدایە ، لە ئاشوبەی گۆڕو سزای ئاگر بیپارێزە ، وە تۆ خاوەنی

وەفاو ڕەوابیت ، سا خوایە لێی خۆش ببەو بەزەیت پێی دا بێتەوە بەڕاستی تۆ لێ بووردەو بەبەزەیی ومیهرەبانیت .

4ـ ( اللهم عبدك وابن عبدك وابن أمتك احتاج إلى رحمتك ،وأنت غني عن عذابه،إن كان مُحسناً فزده في حسناته، وإن كان مُسيئاً فتجاوز عنه ) .

واتە : خوایە ئەمە بەندەتەو نەوەی کۆیلەتە ، پێویستی بەبەزەیی تۆیە ، وە تۆش دەوڵەمەندو بێ نیازی لە سزادانی ، سا خوایە ئەگەر چاکەکارە ئەوا لەچاکەکانی زیاد بکەو ئەگەر خراپەکارە لێی ببورە .

## پاڕانەوە بۆ (کۆرپە) لە نوێژی مردوودا لەسەری

1ـ ( اللهم أعذه من عذاب القبر ) . واتە : خوایە پەنای بدە لە سزای گۆڕ .

( سەعیدی کوری المسیب دەفەرمووێ لە دوای ئەبو هورەیرەوە نوێژم کرد کە لەسەر منداڵێک نوێژی دەکرد کە هەرگیز گوناهی نەکردبوو گوێم لێ ی بوو دەیفەرموو (اللهم أعذه من عذاب القبر) .

2ـ ( اللهم اجعله لنا فرطاً ،وسلفاً وأجراً ) . واتە : خوایە بۆمان بکەرە پاداشتێک لە پێشمانەوە بڕوات و بیکەرە پێشین و پاداشت بۆمان .

## خواردن ناردن بە دیاری بۆ کەس و کاری مردووەکە

عبداللە ی کوری جەعفەر دەیفەرموێ : پێغەمبەری خوا درودی خوای لێبێت فەرمووی : خواردنێک دروست بکەن بۆ کوس و کاری جەعفەر چونکە شتێکیان بەسەر هاتووە کە بەڕاستی سەرقاڵی کردوون ، ئەمەش لەکاتێکدا فەرمووی کە جەعفەری کوری ئەبی طالیب خوا لێی رازی بێت لە جەنگی موءتە دا شەهید بوو .

## ئەگەر مردووت خستە گۆڕەکەی

بڵێ : ( بسم الله وعلى سُنة رسول الله ) . واتە : بەناوی خوای گەورە ، وە لەسەر ڕێڕەوو سوننەتی پێغەمبەری خوا درودی خوای لێبێت .

## پاڕانەوە دوای ناشتنی مردوو

( اللهم اغفر له اللهم ثبته ) واتە : خوایە لیی خۆش بە ، خوایە چەسپاوو دامەزراوی بکە .

( پێغەمبەر درودی خوای لێبێت کە تەواو دەبوو لە ناشتنی مردوو لەسەری ڕادەوەستاو دەیفەرموو : داوای لێ خۆشبوون و دامەزراوی بکەن بۆ براکەتان ، چونکە بەڕاستی ئێستا پرسیاری لێ دەکرێت ) .

## لەکاتی سەردانی گۆڕستان دا

( السلام عليكم أهل الديار ، من المؤمنين والمسلمين،وإنا إن شاء بكم لاحقون [ ويرحم الله المُستقدمين منا والمستأخرين ] أسأل الله لنا ولكم العافية ) واتە سڵاوتان لێ بێت خاوەنی خانەکان لە ئیمانداران و موسوڵمانان ئێمەش بە ویستی خوای گەورە دەگەین پێتان ، خوا بەزەیی بە پێشکەوتوەکانمان و دواکەوتەکانماندا بێتەوە ، لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە ئێمەو ئێوەش بپارێزێ .

## لەکاتی هەڵکردنی (با) دا

1ـ ( اللهم إني أسألك خيرها ، وأعوذ بك من شرها ) واتە : خوایە داوای چاکی و خێرەکەیت لێ دەکەم و پەنات پێ ئەگرم لە خراپەکەی .
2ـ ( اللهم إني أسألك خيرها ، وخير ما فيها ، وخير ما أُرسلت به ، وأعوذ بك من شرها وشر ما فيها وشر ما أرسلت به ) واتە : خوایە من داوای خێرو چاکەکەیت لێ دەکەم و ئەو چاکەیەی کە تیایەتی و ئەو چاکەیەی بۆی نێردراوە ، وە پەنات پێ ئەگرم لە خراپەکەی و لەو خراپەیەی کە تیایەتی و یەو خراپەیەی بۆی نێردراوە .
3ـ جوێن ـ با ـ مەدەن ، ئەگەر قایمی کردو خراپەیەکتان لێ چاوەڕوان دەکرد بڵێن : ( اللهم إنا نسألک من خير هذه الريح وخير ما فيها ، وخير ما أمرت به ، ونعوذ بک من شر هذه الريح وشر ما فيها ، وشر ما أمرت به ) . واتە : خوایە ئێمە داوای چاکەی ئەم بایەت لێ دەکەین و داوای ئەو چاکەیەت لێ دەکەین کە تیایەتی و فەرمانی پێ کراوە وە پەنات پێ دەگرین لەخراپەی ئەم بایەو ئەو خراپەیەی کە تایبەتی و خراپەی یەوەی فەرمانی پێ کراو کە بیکات .

## پاڕانەوە لەکاتی هەورەگرمە ( الرعد )

عبداللە ی کوڕی الزبیر ڕازای خوای لێبێت یەگەر گوێی لە هەورەگرمە بوایە وازی لە قسەکردن دەهێناو دەیفەرموو ( سبحان الذي يُسبح الرعد بحمده والملائكة

من خيفته ) ، واتە : پاكی و بێ گەردی بۆ ئەو خوایەی هەورەگرمە تەسبیحات و ستایشی دەكات ، وە فریشتەكانیش لەترسی ئەو تەسبیحاتی دەكەن .

## لە پاڕانەوەكانی داوای باران بارین كردن (الإستسقاء)

1ـ ( اللهم أغثنا ، اللهم أغثنا اللهم أغثنا ) ، واتە : خوایە بارانمان بۆ ببارێنەو فریامان بكەوە ،

2ـ ( اللهم اسقنا غيثاً مغيثاً مريئاً نافعاً غير ضار ، عاجلاً غير آجل ) ، واتە : خوایە بارانمان بۆ ببارێنە بارانێكی بە لێزمەی ئاسنی سەوزكەری گژوگیا وبەسوودی بێ زیان ، بەم زووانەو دوای مەخە بۆمان .

3ـ ( اللهم اسق عبادك وبهائمك ، وانشر رحمتك وأحي بلدك الميت ) ، واتە : خوایە بەندەكانت تێر ئاوبكە ، هەروەها گیانلەبەرانیش ، وە بەزەیی خۆت بڵاوبكەرەوەو شارە مردووەكەت زیندوو بكەرەوە .

## لەكاتی باران باریندا

( اللهم صيباً نافعاً ) ، واتە : خوایە بارانێكی بە لێزمەی بە سوود بێت .

## ذیكری دوای بارینی باران

( مُطرنا بفضل الله ورحمته ) ، واتە : بارانمان بۆ باری بە فەزڵ و بەزەیی و ڕەحمەتی خوای گەورە .



## لەو پاڕانەوانەی كە بۆ خۆش كردنەوەی باران دەوترێ ( الإستصحاء )

( اللهم حوالينا ولا علينا ، اللهم على الآكامِ والظرابِ وبُطون الأودية ، ومنابت الشجر )

واتە : خوایە لە چوار دەورمان بیبارێنەو لەسەرمان مەیبارێنە ، خوایە : بیبە بۆ سەرگردو كورتە شاخ و ناو شیوو دۆڵەكان و شوێنی ڕووانی دارو درەختەكان .

## لەکاتی تەماشاکردنی مانگ (القمر) دا

( أعوذ بالله من شر هذا الغاسق إذا وقب ) واتە : پەنا ئەگرم بە خوای گەورە لە خراپەی ئەم تاریکییەی شەو کە دادێت .

## لەکاتی بینینی هەیڤ (مانگی یەک شەوە) (الهلال) دا

( الله أكبر ،اللهم أهله علينا بالأمن والإيمان ، والسلامة والإسلام ،والتوفيق لما تحب ربنا وترضى ، ربنا وربك الله ) واتە : خوا گەورەیە ، خوایە ئەم مانگە بیهێنەرەوە بە سەرماندا بە ئاشتی و ئاسایش و ئیمان و بە کامەرانی و ئیسلامی یەوە بە تەوفیق و یارمەتی دانت بۆ ئەو شتەی پەروەردگار تۆ پێت خۆشەو پێی ڕازیت (ئەی مانگ) پەروەردگاری ئێمەو تۆش (الله) یە.

## بە ڕۆژوو بوون

1ـ ( پارشێوبکەن چونکە لە پارشێودا بەرەکەت هەیە )
2ـ ئەگەر بە ڕۆژوو بوویت و جوێنیان پێ دایت ( یان شەڕیان پێ فرۆشتی ) بڵێ : ( إني صائم ، إني صائم ) . واتە : من بەڕۆژووم ، من بەڕۆژووم .
3ـ پێغەمبەر درودی خوای لێبێت لەسەر چەند دەنکە خورمایەکی شل ( رطب ) بەربانگی دەکردەوە پێش ئەوەی نوێژ بکات ، ئەگەر نەبوایە بە خورمای ووشک ( تمرات ) ، ئەگەر نەبوایە بە چەند مشتێک لە ئاو .

## لەکاتی بەربانگ کردنەوەدا

( ذَهبَ الظَّمأُ، وابتلَّت العروقُ وثَبَتَ الأجرُ إنْ شاء الله ) ، واتە : تینوویەتی ڕۆیشت ودەمارەکان ڕەوینەوەو پاداشتەکەمان چەسپاوەو مسۆگەرە بە ویستی خوای گەورە .

## نزاو پاڕانەوەی ئەگەر لەلای ئەهل و خێزانی ماڵێک بەربانگت کردوە

( أَفطَرَ عِنْدَكُم الصائِمونَ وأكل طعامَكُمُ الأبْرارُ،وصلت عليكُمُ الملائِكَةُ ) ، واتە : یاخوا ڕۆژووەوانان لە لاتان بەربانگ بکەنەوەو خواناس و بێ گوناهان لە خواردنتان بخۆن و مەلائیکەت بۆتان بپاڕێنەوە .

## نزاو پاڕانەوەی ڕۆژووەوان ئەگەر خواردنیان هێناو نەیشكاند

( إذا دُعي أحدكم فليجب ، فإن كان صائماً فليصل وإن كان مفطراً فليطعم"[2] ومعنى فليصل أي فليدع ) ، واتە : ئەگەر یەكێك لە ئێوە بانگ كرا بۆ دەعوەتێك با

---

## تەكبیر كردن بۆ جەژنەكات

كاتی تەكبیر كردن لە جەژنی ڕەمەزاندا لەكاتی دەرچوونەوەیە بۆ نوێژ تا نوێژ تەواو دەبێ و لە جەژنی قوربانیشدا لە بەرەبەیانی ڕۆژی عەرەفەوەیە تا كۆتایی ڕۆژی (أيام التشريق) .

بەم شێوەیە :

1ـ (الله أكبر الله أكبر ، لا إله إلا الله ، والله أكبر الله أكبر ، ولله الحمد )

2ـ (الله أكبر الله أكبر ، ولله الحمد ، الله أكبر وأجل ، الله أكبر على ما هدانا )

واتە : خوا گەورەیە ، خوا گەورەیە ، خوا گەورەیە و ستایش بۆ خوایە ، خوا گەورەیەو خاوەنی شكۆو ڕێزە ، خوا گەورەیە لەسەر ئەوەی ڕێنمایی كردووین .

تێبینی : تەكبیر كردن لە جەژندا لە هەموو كاتەكانی دا (كە دیاری كراوە) سوننەتەو تایبەت نی یە بە دوای نوێژە فەرزەكانەوە بەس ، وە دروستە كە دەنگی هەڵبڕێ .

جەژنە پیرۆزە كردن

( تقبل الله منا ومنكم ) ، واتە : خوا لە ئێمەو لە تۆش قبوڵ بكات .

ڕۆژووە سوننەتەكان

1ـ شەش ڕۆژ لە مانگی شەوال (شەشەڵان) : پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێبێت) دەفەرموویت : ( هەر كەسێك مانگی ڕەمەزان بگرێت و بە دوای دا شەش ڕۆژ لە مانگی شەوال بگرێت وەكو ڕۆژووی ساڵەكە وایە ) .

2ـ ( نۆ ) ڕۆژی یەكەمی مانگی (ذی الحجە) نومێنەی حاجیان .

3ـ مانگی موحەڕەم : ( چاكترین ڕۆژوو دوای ڕەمەزان مانگی موحەرەمە ...)

4ـ مانگی شعبان .

5ـ دووشەمە و پێنج شەممەی هەموو هەفتەیەك .

6- ڕۆژە سپی یەکان (أيام البيض) واتە : (13،14،15) ی هەموو مانگێک (مەبەست مانگی کۆچی یە) .....( بۆیە پێی دەوترێت(أيام البيض) چونکە مانگ لەو سێ شەوەیدا زۆر ڕووناکەو دیارە .
7- ڕۆژ نا ڕۆژێک : ( لەڕۆژووی داود پێغەمبەر (عليه الصلاه والسلام ) چاکتر نی یە کە نیوەی ساڵی دەگرت ، ڕۆژێک بگرەو ڕۆژێک بشکێنە ) . ئەوەش بە مەرجێک شەرع ڕازی بێت و نەکەوێتە ئەو ڕۆژانەی کە دروست نی یە بە ڕۆژوو بێت تیایدا وەک : ( جاژن ، ايام التشريق ، ڕۆژی هەینی بە تەنها ، ڕۆژی شەممە(مەگەر بۆ فەرز بێت) ... هتد .
8- ڕۆژووی عەرەفە : ( ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە خوای گەورە دەیکاتە مایەی سڕینەوەی گوناهی ساڵێکی پێشووی وە ساڵێکی دوایی ) .
9- ڕۆژووی عاشورا واتە : (10) ی مانگی مەحەرەم : ( ...وە ڕۆژووی ڕۆژی عاشورا خوای گەورە گوناهی ساڵێکی پێشوی پێ دەسڕێتەوە .

## لەکاتی تووڕەبووندا

بڵێ : ( أعوذ بالله من الشيطان الرجيم ) ، واتە : پەنا دەگرم بە خوای گەورە لە شیطانی نەفرەت لێ کراوو دوورخرایەوە لە ڕەحمەتی خوا .

## ئەگەر کەسێکی تووش بوو بە بەڵایەکەت بینی

بڵێ : ( الحمد لله الذي عافاني مما ابتلاک به ، وفضلني على كثير ممن خلق تفضيلا ) ، پێغەمبەر درودی خوای لێبێت دەیەم ڕۆژی گرت و فەرمووی ئەگەر ساڵێکی تر بمێنم نۆیەمیشد دەگرم ، بەڵام ئەوەبوو لەساڵی داها تیودا وەفاتی کرد .

## لەو زیکرانەی لە دانیشتگا (مجلس) دا دەووترێ

لە ابن عمرەوە فەرموویەتی : پێغەمبەر درودی خوای لێبێت پێش ئەوەی هەستێ لە مەجلیسێکدا سەد جار دەیفەرموو : ( رب اغفر لي وتب علي إنك أنت التواب الغفور ) واتە : خوایە پەروەردگار لێم خۆش بەو گەڕانەوەم لێ وەربگرە بەڕاستی تۆ تۆبە وەرگری لێ بووردەیت .

بچێت ، ئەگەر بەڕۆژوو بوو ئەوا با بپاڕێتەوە بۆیان بە بەرەکەت و ئەگەر ڕۆژوو نەبوو بابخوات .

## کەفارەتی دانیشتگا (مەجلس)

( سبحانك اللهم وبحمدك ، أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك ) ، واتە :
خوایەپاک و بێ گەردی و ستایش بۆ تۆیە ، شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێک نی یە بە هەق جگە لەتۆ ، داوای لێ خۆشبوونت لێ دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لات .
هەرکەسێک لە مەجلیسێکدا دانیشێ و زۆر هەڵەو قسەی بێ بایەخی تێدا بکات و پێش ئەوەی لەو مەجلیسە هەستێ بڵێ ...(فەرموودەکە) ...ئیلا خوا لە تاوانی ئەو مەجلیسەی خۆش دەبێ .

## ئەگەر کەسێک پێی ووتی خوا لێت خۆش بێت ( غفر الله لک )

لە عبداللە ی کوڕی سرجس ەوە دەفەرمووێت : هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەر دروودی خوای لێبێت و لەو خواردنەکەیم خواردو پێم ووت : (غفر الله لک )
خوا لێت خۆش بێت ئەی پێغەمبەری خوا ، ئەویش فەرمووی : ( ولک ) واتە : وە لەتۆش خۆش بێت .

## ئەگەر یەکێک چاکەیەکی لەگەڵدا کردیت

( هەر کەسێک چاکەیەکی لەگەڵ دا کراو بە بکەری چاکەکەی ووت ( جَزَاكَ اللهُ خيراً ) واتە : خوا پاداشتی چاکات بداتەوە ، ئەوا ئەوپەڕی سوپاس و ستایشی کردووە ) .

## ئەو زیکرەی کە خوا دەتپارێزێ بەهۆیەوە لە (دەججال)

( من حفظ عشر آيات من أول سورة الكهف عصم من الدجال ) ، واتە : هەر کەسێک (10) ئایەتی سەرەتای سورەتی ( الكهف ) لەبەر بکات لەدەجال دەپارێزرێت .

## ئەگەر کەسێکت لەبەر خوا خۆش ویست

پێی بڵێ : ( إني أحبک في الله ) ، واتە : من لەبەر خوای گەورە تۆم خۆش دەوێت .

## ئەگەر موسوڵمانێک پێی ووتی من لەبەر خوا خۆشم دەوێیت

پێی بڵێ : ( أحبك الذي أحببتني له ) ، واتە : ئەو خوایە خۆشی بووێیت کە منت لەبەر ئەو خۆش دەوێ .

## ئەگەر موسوڵمانێک پێ کەنی

پێی بڵێ : ( أضحک الله سنک ) ، واتە : یاخوا هەردەم لە پێکەنین و دڵ خۆشی دا بیت

## ئەگەر کەسێک پارەو سامانی خستە ڕووت

پێی بڵێ : ( بارك الله لك في أهلك ومالك ) ، واتە : خوای گەورە فەڕو بەرەکەت بخاتە خێزان و ماڵ و سامانتەوە .

## نزاو پاڕانەوە بۆ خاوەن ماڵ لەکاتی قەرز گەڕاندنەوەدا

( بارك الله لك في أهلك ومالك إنما جزاء السلف الحمد والأداء ) ، واتە : خوا بەرەکەت بخاتە ناو خێزان و سامانتەوە ، بەڕاستی پاداشتی قەرز دان سوپاس و ستایش کردن و قەرزگەڕاندنەوەیە وەک خۆی .

## نزاو پاڕانەوەی ترسان لە هاوبەش دانان بۆ خوا (الشرك)

( اللهم إني أعوذ بك أن أشرك بك وأنا أعلم ، وأستغفرك لما لا أعلم ) ، واتە : خوایە پەنات پێ ئەگرم لەوەی کە هاوبوشت بۆ دابنێم و ئاگادارت بم پێی ، وە داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم لەوەی کە نایزانم و ئاگادار نیم پێی .

## کەفارەتی سوێند خواردن بە غەیری خوا

(پێگەمباری خوا دەفەرمووێت : هەر کەسێک سوێندی خواردو وتی بە لات و عوزا ، با بڵێ ( لآ إله إلا الله ) وە هار کەسێک بە هاوڕێکەی ووت : وەرە با قومارت لەگەڵ بکەم با خێرێک بکات ) .

## ئەگەر یەکێک پێی ووتی (بارك الله فيك)

عائیشە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی : مەڕێکیان بە دیاری هێنا بۆ پێغەمبەری خوا دروودی خوای لێبێت ، ئەویش فەرمووی : بەشی بکە ، وە

عائیشە ڕەزای خوای لێبێت کاتێک خزمەت کارەکەی دەگەڕایەوە لە ماڵەکان دەیفەرموو : وتان چی ؟ دەیفەرموو : دەیان ووت ( **بارك الله فيكم** ) واتە : خوا بەرەکەت بخاتە ناوتان ، عائیشە دەیفەرموو : (( وفيهم بارك الله ) نرد عليهم مثل ماقالوا ويبقى أجرنا لنا ) ) ، واتە : خوای گەورە بەرەکەت بڕژێ بەسەر ئەوانیشدا ، چی یان ووت پێ یان دەڵێینەوە وە پاداشتەکەمان بۆ خۆمان دەمێنێتەوە .

## پاڕانەوەی بە دڵ دا هاتنی ڕەشبینی و شوومی(الطيرة)

(اللهم لا طير إلا طيرك ، ولا خير إلا خيرك ،ولا إله غيرك )

( بەڵام گەشبینی (الفال) پێغەمبەر درووودی خوای لێبێت پێی خۆش بووە ، بۆیە ووشەیەکیلە کابرایەک بیست و پێی خۆش بوو فەرمووی : ( أخذنا فالك من قبل ) واتە : ووشەیەکی گەشبیناویمان لەدەمی خۆتەوە وەرگرت .

## پاڕانەوەی سوار بوونی ووڵاغ یان ئامێری گواستنەوە

( بسم الله. الحمد لله. {سُبْحانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ * وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ}الحمد لله، الحمد لله، الحمد لله، الله اكبر، الله اكبر، الله اكبر، سبحانك اللهم إني ظلمت نفسي فاغفر لي،إنه لا يغفر الذنوب إلا أنت ) ،

واتە : بەناوی خوا ، ستایش بۆ خوا ، پاکی و بێ گەردی بۆ ئەو خوایەی ئەمەی بۆ ژێربار خستوین و ئێمە دەستەڵاتمان نەبوو بە سەری دا ، وە ئێمە ( لە ڕۆژی دوایی دا ) بۆلای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە ، سوپاس و ستایش بۆ خوا ... خوا گەورەیە ... پاکی وبی گەردی بۆ تۆیە خوایە من ستەمم لە نەفسی خۆم کردووەو لێم خۆش بە ، بەڕاستی کەس لە کوناە خۆش نابێ جگە لەتۆ .

## نزاو پاڕانەوەی چوون بۆ گەشت ( سەفەر )

1ـ ( الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر،{سُبْحانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ * وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ} "اللهم إنا نسألُكَ في سفرنا هذا البرَّ والتقوى، ومن العمل ما ترضى، اللهم هون علينا سفرنا هذا واطو عنا بعده، اللهم أنت الصاحب في السفر، والخليفة في الأهل، اللهم إني أعوذ بك من وعْثاءِ السفر، وكآبة المنظر وسوء المنقلب في المال والأهل )

، وا یاگار گەرایەوە لەسەفەر دەیلێتەوەو ئەمەی بۆ زیاد دەکات : ( آیبون ، تائبون، عابدون، لربنا حامدون ) .

واتە : خوا گەورەیە ... پاکی و بێ گەردی بۆ ئەو خوایە ئەمەی بۆ ژێر بار خستووین و ئێمە دەسەڵاتمان نەبوو بەسەری دا ، وە ئێمە لە ( رۆژی دوایی دا ) بۆ لای پەروەردێگارمان دەگەرێینەوە . خوایە لەم گەشتەماندا داوای کردەوەی چاک و رەفتاری جوان و تەقوات لێ دەکەین و داوای کارێکت لێ دەکەین کە پێی رازی بیت ، خوایە ئەم گەشتەمان بۆ ئاسان بکەو دووری یەکەیمان بۆ نزیک بخەرەوە ، خوایە تۆ ئاگات لێمانە لە گەشتەکەمانداو تۆ پارێزەری کەس و کارمانی (کە جێمان هێشتووە) ، خوایە پەنات پێ ئەگرم لە نارەحەتی و ناسۆری گەشت و غەمباری رواڵەت و شتێک کە غەمبارم بکات و خراپ گەرانەوە بۆ ماڵ و خێزان (بەوەی کە شتێکیان لی ببینم دڵ تەنگم بکات ) .... گەرانەوە لە بی ئاگایی (بە ویستی خوا) ، بەتەوەبەکردن و پەرستشەوە ، ستایشی پەروەردگارمان دەکەین .

## ئەو شتانەی پەنا دەگری بە خوای گەورەلێی لەگەشتدا

لە عبداللە ی کوری سرجس رەزای خوای لێبێت دەفەرمووێت : ( کان رسول اللە صلی اللە علیە وسلم إذا سافر یتعوذ من وعثآء السفر وکآبة المنقلب ، والحور بعد الکور ، ودعوة المظلوم ، وسوء المنظر في الأهل والمال ) ،

واتە : پێغەمبەری خوا درودی خوای لێبێت ئەگەر سەفەری بکردایە پانای دەگرت بەخوای گەورە لەناسۆری گەشت و غەمباری روالەت و گەرانەوە بە غەمباری لە نوقسانی دوای زیادە (یان لە خراپ بوونی کاروبارمان دوای چاک بوونی) وە لە پارانەوەی ستەم لێ کراوو خراپ گەرانەوە بۆ ناو کەس وکارو ماڵ و سامان .

## نزاو پارانەوەی چوونە ناو گوندێک یان شارێک

( اللهم رب السموات السبع وما أظللن ، ورب الأرضین السبع وما أقللن ،ورب الشیاطین وما أضللن ، ورب الریاح وما ذرین.أسألك خیر هذه القریة وخیر أهلها ، وخیر ما فیها،وأعوذ بك من شرها،وشر أهلها ، وشر ما فیها ) ،

واتە : خوایە پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکان و ئەوەی سێبەری بۆ دەکات ، وە پەروەردگاری حەوت چینەکەی زەوی و ئەوەی هەڵی گرتووە ، پەروەردگاری شەیطانەکان و ئەوانەی گومرایان کردوون ، پەروەردگاری (با ) کان و ئەوەی لەگەڵ خۆیاندا دەیبەن ، داوای خێرو چاکەی ئەم گوندەو

چاکەی خەڵکەکەی و ئەو چاکەیەت لێ دەکەم کە تیایدایەو پەنات پێ دەگرم لەخراپەکەی و خراپەی خەڵکەکەی و خراپەی ئەوەی تیایەتی .

## نزای چوونە بازاڕ

( لا إله إلا الله وحده لا شريك له،له الملك وله الحمد،يُحيي ويُميت،وهو حي لا يموت،بيده الخير وهو على كل شئ قدير ) ، واتە : هیچ پەرستراوێک نی یە بە هەق جگە لە ( اللە ) تاکی بێ هاوەڵەو موڵک و ستایش بۆ ئەوەو ئەژیەنێ و ئەمرێنێ و خۆی زیندووەو هەرگیز نامرێ ، خێرو چاکە بەدەست ئەوەو بەسەر هەموو شتێک دا بە تواناو دەسەڵاتدارە .

## لەکاتی هەڵدێرانی ئامێری سواری یان سەرسم دانی دا

بڵێ (بسم الله) ، واتە : بەناوی خوای گەورە .
( هەرکەسێک ئەمە بڵێ هەزار هەزار ( ملیونێک ) چاکەی بۆ دەنوسرێ و هەزار هەزار گوناهی لێ هەڵدەوەرێ و هەزار پلە بەرزدەبێتەوە لای خوای گەورە ( وە ماڵێکی لە بەهەشت دا بۆ دروست دەکرێت ) .

## نزاو پاڕانەوەی ئەو کەسەی دەچێت بۆ گەشت (المسافر) بۆ جێماو

(أستودعُكَ الله الذي لا تضيع ودائعه ) ، واتە : ئەتان سپێرم بەو خوایەی کە سپاردە زایە ناکات .

## پاڕانەوەو ئامۆژگاری جێماو بۆ ئەو کەسەی دەچێت بۆ گەشت

1ـ ( أستودع الله دينك وأمانتك ،وخواتيم عملك ) ، واتە : دین و ئەمانەت و کۆتایی کردەوەکانت دەسپێرم بە خوای گەورە .
2ـ ( زوَّدك الله التقوى، وغفر ذْنبك ويسَّر لك الخير حيث ما كنت ) ، واتە : خوا تەقوات زیاد بکات و لە گوناهت خۆش بێت وخێرو چاکەت بۆ ئاسان بکات لەهەر جێگەو شوێنێک بوویت .
3ـ لە ئەبی هورەیرەوە ( ڕەزای خوای لێ بێ ) پیاوێک ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا من ئەمەوێت سەفەر بکەم ، سا ئامۆژگاریم بکە ، ئەویش

فەرمووی : ( عليك بتقوى الله ، والتكبير على كل شرف ) ، واتە : تەقوای خوات هەبێت و لەسەر هەموو بەرزاییەک تەکبیر (الله أكبر) بکە ، جا کاتێ پیاوەکە پشتی هەڵکردو ڕۆیشت پێغەمبەر دروودی خوای لێبێت فەرمووی : ( اللهم أطوله الارض ، وهون عليه السفر ) ، واتە : خوایە زەوی بۆ بێنەوە یەک و گەشت و سەفەرەکەی لەسەر ئاسان بکە .

## تەکبیر کردن لەبەرزایی و سەرکەوتن و تەسبیح کردن لە دابەزیندا

(قال جابر رضي الله عنه : "كنا إذا صعدنا كبرنا، وإذا نزلنا سبحنا ) ، واتە : جابر ڕەزای خوای لێبێت دەیفەرموێت : ئێمە ئەگەر بە شوێنی بەرزدا سەربکەوتینایە ( الله أكبر ) مان دەکردو ئەگەر دابەزینایە (سبحان الله) مان دەکرد .

## پاڕانەوەی گەشتیار ئەگەر پارشێوی بەسەردا هات

( سَمِعَ سَامِعٌ بحمد الله وحُسنِ بلائه علينا، ربنا صاحبنا ، وأفضِل علينا عائذا بالله من النار ) ، واتە : (سمع سامع) شایەتێک ئاگادار بوو شایەتی دا لەسەر ستایش کردنمان بۆ خوای گەورە لەبەر نیعمەتەکانی و چاک و تاقی کردنەوەمان ، وە مانای (سمع سامع) : واتە : بیسەری ئەم ووتەیەم گەیاندی بە غەیری خۆی و ئەویش وەکو ئەمەی ووت بۆ ئاگادار کردنەوە لەسەر ذیکرکردن لە پارشێوداو لەسەر پاڕانەوە تیایدا ، وە پەروەردگار بمانپارێزەو فەزڵی خۆتمان بەسەردا بڕژە بە نیعمەتەکانت و هەموو خراپەیەکمان لێ دوور بخەرەوە ، پەنا ئەگرم بە خوای گەورە لە ئاگری دۆزەخ .

## نزاو پاڕانەوەی گەشتیار ئەگەر دابەزییە جێگایەکە لە گەشتەکەیدا یان

بڵێ : ( أعوذ بكلمات الله التامات من شر ما خلق ) ، واتە : پەنا ئەگرم بە ووشە تەواوەکانی خوای گەورە لە خراپەی دروست کراوەکانی .

## نزاو ذیکری گەڕانەوە لە گەشت

لە ابن عمرەوە ڕەزای خوای لێبێت : پێغەمبەری خوا درودی خوای لێبێت ئەگەر لە غەزا یان لە حەج بگەڕایەتەوە لەسەر هەموو بەرزاییەک سێ

جار ( اللـه اكبر ) ی دەكرد و پاشان دەیفەرموو : ( يكبر على كل شرف ثلاث تكبيرات ثم يقول : لا إله إلا الله وحده لا شريك لهُ ،لهُ الملك ، ولهُ الحمدُ وهو على كل شيءٍ قدير ، آيبون ،تائبون ، عابدون ، لربنا حامدون ،صدق الله وعده،ونصر عبده،وهزم الأحزاب وحده ) ، واتە : هیچ پەرستراوێک نی یە بە هەق جگە لە (اللـه) تاكی بێ هاوەڵە ، مولک و ستایش بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێكدا بەتوانایە ، گەڕینەوە لەبێ ئاگایی بەتەوبوكردن و پەرستش كردن و كورنوش بردنەوە . سوپاس و ستایشی پەروەردگارمان دەكەین . خوای گورە بەڵێنەكەی بەڕاست بەجێ هێناو بەندەكەی خۆی سەرخست و بەتەنها خۆی هەموو كۆمەڵ و پارتەكەی شكاند .

## لەكاتی هاتنی شتێكی خۆش یان ناخۆشی دا

پێغەمبەری خوا درودی خوای لێبێت ئەگەر شتێكی خۆشی بەسەردا بهاتایە دەیفەرموو : ( الحمد لله الذي بنعمته تتم الصالحات ) واتە : سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی كە نیعمەتی ئەوەو هەموو چاكەكان تەواو دەبێ .
وائەگەر شتێكی ناخۆش بەسەردا بهاتایەوە دەیفەرموو : ( الحمد لله على كل حال ) ، واتە : سوپاس و ستایش بۆ خوایە لەسەر هەموو بارێک .

## فەزڵی صڵاوات دان لەسەر پێغەمباری خوا دروودی خوای لێبێت

1 ـ پێغەمبەر درودی خوای لێبێ دەفەرموێت : ( من صلى علي صلاة صلى الله عليه بها عشراً ) ، واتە : هەركەسێک یەک صڵاواتم لەسەر بدات خوای گەورە بەهۆیەوە (دە) صڵاواتی لەسەر دەدات .
ئیمامی (الطیبی) دەفەرموویت : ( ئەگونجێ ئەو صڵاواتەی خوای گەورە ڕواڵەتەكەی ووتەو قسەیەک بێت كە مەلائیكەتەكان دەیبیستن ، بۆ ڕێزلێنانێكە بۆ ئەو كەسەی كە صڵاواتەكەی داوەو تەكریمە بۆ ئەو ، وەک خوای گەورە لە فەرموودەی قودسی دا دەفەرموێ : ( وإن ذكرني فی ملأ ذكرته فی ملإ خير منهم...) واتە : ئەگەر لەناو كۆمەڵێكدا یادم بكات ، منیش لەناو كۆمەڵێكی لەوان چاكتردا باسی دەكەم .

2ـ ( لا تجعلوا قبري عيداً وصلوا علي ؛ فإن صلاتكم تبلغني حيث كنتم ) ، واتـه : دواى خۆم گۆڕەكەم مەكەن بە ئاهەنگ و جەژن و صڵاواتم لەسەر بدەن ، چونكە صڵاواتەكانتانم پێ دەگات لەگەر شوێنێک بن .

3ـ وە پێغەمبەری خوا درودی خوای لێبێت دەفەرمووێت : ( إن لله ملائكة سياحين في الأرض يبلغوني من أمتي السلام ) ، واتـه : خواى گەورە چەند مەلائيكەتێكى گەڕۆكى هەيە لە زەوى دا سڵاوى ئومەتەكەمم پێ دەگەيەنن كە لێم دەكەن .

4ـ ( ما من أحد يسلم علي إلا رد الله على روحي حتى أرُدُّ عليه السلام ) واتـه : هيچ كەسێک نى يە كە سڵاوم لێ بكات ئيلا خواى گەورە ڕۆحەكەم بۆ دەگێڕێتەوە هەتا وەڵامى سڵاوەكەى دەدەمەوە .

5ـ پێغەمبەری خوا درودی خوای لێبێت دەفەرمووێت ( البخيل من ذكرت عندهُ فلم يصل علي ) ، واتـه : بەخيل ئەو كەسەيە كە لەلايدا ناوم دێنن و صڵاواتم لەسەر نادات .

## بڵاو كردنەوەى سڵاو

1ـ پێغەمبەر درووده خواى لێبێت دەفەرمووێت : ( لا تدخلوا الجنة حتى تؤمنوا ، ولا تؤمنوا حتى تحابوا أو لا أدلكم على شيءٍ إذا فعلتموه تحاببتم ، أفشوا السلام بينكم ) واتـه : ناچنە بەهەشتەوە هەتا بڕواتان نەبێ و بڕواو ئيمانى تەواويتان نابێ هەتا يەكتيتان خۆش نەوێ ، ئايا شتێكتان پێ بڵێم ئەگەر بيكەن لە ناويەكدا خۆشەويست دەبن لاى يەک ؟ سڵاو زۆر بڵاو بكەنەوە لەناو خۆتاندا .

2ـ وە عەممارى كوڕى ياسر ڕەزاى خواى لێبێت دەفەرمووێت : ( ثلاث من جمعهن فقد جمع الإيمان : الإنصاف من نفسك ، وبذل السلام للعالم ،والإنفاق من الإقتار ) ، واتـه : سێ شت هەن هەركەس لەخۆى دا كۆى بكاتەوە ئەوا ئيمانى كۆكردۆتەوە : ويژدان هەبوون لە حوكم دان بەرامبەر خۆت ، وە سڵاوكردن لە خەڵكى ، وە بەخشين لە كەم دەستى و هەژارى .

3ـ وە لە عبداللە ى كەرى عومەرەوە ڕەزاى خوايان لەسەر بێت : كەوا پياوێک پرسيارى كرد لە پێغەمبەرى خوا درووددى خواى ليبێتكە كام ئيسلام بوونە چاكە ، فەرمووى : ( تطعم الطعام وتقرأ السلام على من عرفت ومن لم تعرف )

، واتە : خواردن ببەخشەو سڵاو بکە لەو کەسەی کە دەیناسی و ئەوەشی کە نایناسی .

## چۆن وەڵامی بێ بڕوایەک دەدەیتەوە ئەگەر سڵاوی کرد

( إذا سلم عليكم أهل الكتاب فقولوا : وعليكم ) واتە : ئەگەر خاوەن کتێبەکان (گاورو جولەکە) سڵاویان لێ کردن بڵێن لە ئێوە بێ .
تێبینی : سڵاو کردن دروست نی یە لە کافرو بێ بڕواو دووڕووەکان ، مەگەر زەرەرێکی دین و دونیا بکەیت لە ئەنجامی ئەو سڵاونەکردنەوە لێی( لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێ : چونکە لەو کاتەدا پێیان دەڵێن (السام عليكم ) واتە : مردن بۆ ێێوە بێت ) ، وەک ئیمامی نەوەوی و العربی دەفەرموون .
وابن العربي زیاد لەوەش دەفەرموێت وە دەبێ لەوتنی (السلام عليكم ) وکەش مەبەستت وابێ کەوا خوای گەورە ئاگادارە بەسەرتانەوە ، چونکە (السلام) ناوێکە لەناوەکانی خوای گەورە .
تێبێنی: سڵاوکردن لە مەجلیسێکی تێکەڵ لە کافرو موسوڵمانان دروستە بە مەرجێ مەبەستت موسوڵمانەکای بێت .

## پاانەوەی بۆ ئەو کەسەی کە جوێنت پێ داوەو ئەزیەتت داوە

لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێبێت کەوا بیستویەتی لە پێغەمبەری خوا درودی خوای لێبێت کە فەرموویەتی : ( اللَّهُم فأيما مؤمن سببته فاجعل ذلك له قربة إليك يوم القيامة ) ؛ واتە : خوایە جوێنم بەهەر ئیماندارێک داوەو ئەزیەتم داوە ئەوا بۆی بکەرە نزیک بوونەوەیەک لەخۆت لە ڕۆژی دوایی دا .

## لەکاتی خوێندنی کەڵەشێرو زەڕەی گوێ درێژدا

پێغەمباری خوا درودی خوای لێبێت دەفەرموێت ( ئەگەر گوێتان لەدەنگی کەڵەشێر بوو داوای فەزڵی خوای گەورە بکەن ( اللهم إني أسالک من فضلک ) چونکە مەلائیکەتی بینیوە ، وە ئەگەر گوێتان لە دەنگی زەڕینی گوێ درێژ بوو پەنا بگرن بەخوای گەورە لە شیطان ( أعوذوا بالله من الشيطان الرجيم ) چونکە شیطانی بینیوە .
ئەگەر گوێت لەدەنگی سەگ بوو بەشەو

پێغەمبەری خوا دروودی خوای لێبێت دەفەرموێ : ( إذا سمعتم نُباح الكلاب ونهيق الحمير بالليل فتعوذوا بالله فإنهن يرين ما لا ترون ) ،
واتە : ئەگەر گوێتان لە دەنگی وەڕینی سوگ و زەڕەی گووێ درێژ بوو بەشەو ئەوا پەنا بگرن بەخوای گەورە لێ یان چونکە ئەوان شتێک دەبینن لەو کاتەدا کە ئێوە نایبینن .

## موسوڵمان چی بڵێ لەکاتی مەدح کردنی موسوڵمانێک دا

پێغەمبەری خوا دروودی خوای لێبێت دەفەرموێت : ئەگەر یەکێ لە ئێوە هەردەبوو بە چاکە باسی هاوەڵەکەی بکات بابڵێ : ( إذا سمعتم نُباح الكلاب ونهيق الحمير بالليل فتعوذوا بالله فإنهن يرين ما لا ترون ) ، واتە : گومان دەبەم و وابزانم کە فلانە کەس ( کەخوای گەورەش باشتر دەیناسێ و دەزانێ و کەس بەسەر خوای گەورەدا پاک ڕاناگرم ) ، وای دەناسم ـ ئەو سیفەتەی تێدا شک برد ـ ئاواو ئاوایە .
تێبێنی : پێغەمبەری خوا درودی خوای لێبێت فەرمانی کردووە بە خۆڵ کردن بەدەم و چاوی مەدح کەراندا .

## موسوڵمان چی دەڵێ ئەگەر بە باش باس کرد

( اللهم لا تؤاخذني بما يقولون ، واغفر لي مالا يعلمون [واجعلني خيراً مما يظنون] ) ، واتە : خوایە ئەوەی ئەوان دەیڵێن بەگوناه لەسەرم مەگرەو لەو گوناهانەم خۆش ببە کە ئەوان نایزانن و لەو مەدح و وەسف چاکترم بکە کە ئەوان گومانم پێ دەبەن .

## چۆن حاجی تەلبیە دەکات لە حەج یان لە عومرەدا

1 ـ ( لبيك اللهم لبيك ، لا شريك لك لبيك ،إن الحمد ،والنعمة ،لك والملك ، لا شريك لك ) ، واتە : وەڵامی دوای دەدەمەوە لە گوێ ڕایەڵیت دا ، هیچ هاوبەشێکت نی یە ، ستایش و نیعمەت و موڵک بۆتۆیە ، هیچ هاوبەشێکت نی یە .
2 ـ وە عومەر ڕەزای خوای لێ بێت دەیفەرموو : ( لبيك اللهم لبيك ، لبيك وسعديك ، والخير في يديك ، لبيك والرغباء إليك والعمل ) واتە : خوایە وەڵامی دوای وەڵام و گوێ ڕایەڵم هەیە بۆ فەرمانەکانت ، خێروچاکە لەدەستی تۆدایە ، وەڵامی فەرمان و ئومێدو هیواو کردار ئەنجام دان بۆ تۆیە .

## تەكبیر كردن كاتێ دەگاتە گۆشە ڕەشەكە (الركن الاسود)

پێغەمبەری خوا دروودی خوای لێبێت بەسەر حوشترەكەیەوە بە دەوری كەعبەدا سووڕایەوەو هەركاتی ئەگەیشتە گۆشەكە بەرەو ڕووی ئیشارەتی دەكرد بەشێك كە پێی بوو وە ( اللە اكبر ) ی دەكرد . ( مەبەست بە (شت) لە فەرموودەكەدا بریتی یە لە (گۆچان) .

## پاڕانەوە لە نێوان گۆشەكەی لای یەمەن (الركن الیمانی) و بەردە ڕەشەكە ( الحجر الاسود )

پێغەمبەری خوا دروودی خوای لێبێت لە نێوان گۆشەی ڕووی یەمەن و بەردە ڕەشەكە دا دەیفەرموو ( رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ ) ، واتە : پەروەردگار لە دونیادا چاكەو لە ڕۆژدا چاكەمان پێ ببەخشەو لە سزای ئاگر بمانپارێزە .

## پاڕانەوەی وەستان لەسەر (صەفا) و (مەروە)

جابر ڕەزای خوای لێبێت لەباسی شێوازی حەجی پێغەمبەردا دروودی خوای لێبێت دەفەرموێت : ( كاتێك نزیك بوونەوە لە صەفا فەرمووی : ( إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ ) ، أبدأ بما بدأ الله به ) ، واتە : ( صەفاو مەروە لە دروشمەكانی خوای گەورەیە كە دایناوە ، بەوەیان دەست پێ دەكەم كە خوای گەورە دەستی پێ كردووە ) ، بۆیە بە صفا دەستی پێ كرد و سەركەوت بەسەری دا هەتا چووە سەرەوەو كەعبەی بینی و ڕووی كردە ڕووگە (قیبلە) و گەورەی بە تاك ڕاگرت و بەگەورەی داناو فەرمووی : ( لا إله إلا الله وحده لا شريك لهُ ، لهُ الملك ولهُ الحمد وهو على كل شيءٍ قدير ، لا إله إلا الله وحده ، أنجز وعده ، ونصر عبده ، وهزم الأحزاب وحده ) ، واتە : هیچ پەرستواوێك نی یە بەهەق جگە (اللە) تاكی بێ هاوەڵەو موڵك وستایش بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێكدا بە توانایە ، هیچ پەرسراوێك نی یە بە هەق لا (اللە) تاكە ، بەڵێنی خۆی هێنایەدی و بەندەكەی خۆی سەرخست و بە تەنیا هەموو كۆماڵ و پارتەكانی شكان ، پاشان لەم نێوانەدا پاڕایەوە ، وە سێ جار وەك ئەمەی فەرموو ) ، فەرموودەكە ...وە تیایدا هاتووە كە ( چی لەسەر صەفا كردن ئاواشی لەسەر مەروە كرد ) .

## لە کاتی ڕۆیشتندا بەرەو عەرەفە

لە ابن عمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێت دەفەرموێت : بەیانی یەک لەگەڵ پێغەمبەری خوادا دروودی خوای لێبێت لە میناوە ڕۆیشتین و کەوتینە ڕێ بەرەو عەرەفات ، تیاماندبوو تەلبیەی دەکردو هەشمانبوو تەکبیری دەکرد .

## نزاو پاڕانەوەی ڕۆژی عەرەفە

( چاکترین پاڕانەوە ، پاڕانەوەی ڕۆژی عەرەفەیە ، وا چاکترین نزایەک کە من و پێغەمبەرانی پێش من فەرموویانە ئەمەیە : ( لا إله إلا الله وحدهُ لا شريك لهُ ، لهُ الملكُ ولهُ الحمدُ وهو على كل شيء قدير ) .

( وە سوننەت وایە جگە لە ووتنی ئەم ئەم ذیکرە تەلبیە بکات و بپاڕێتەوە )

## نزاو ذیکری لای ( المشعر الحرام )

جابر ڕەزای خوای لێ بێت دەفەرموێت : ( پێغەمبەری خوا درووده‌ی خوای لێبێت سواری (القصواء) بوو ـ کە حوشترەکای بوو ـ هەتا گەیشتە (المشعر الحرام) و ڕووی کردە ڕووگە (القبلة) وە پاڕایەوەو ( الله أكبر ولا إله إلا الله وحده لا شريک له ) ی کردو بەردەوام ئاوا بە پێوە مایەوە هەتا بە تەواوی دنیا ڕووناک بوویەوەو پێش ئەوەی خۆر هەڵبێ ڕۆیشت و دەرچوو .

تەکبیر کردن لەکاتی ڕەجم کردنی (الجمار) ەکاندا لەگەل هەموو زیخێکدا پێغەمبەری خوا درووودی خوای لێبێت هەرکات زیخێکی دەهاویشت لە لای (الجمار) ەکانەوە تەکبیر ( الله أكبر ) ی دەکرد ، پاشان دەچووە پێشەوەو دەوەستاو ڕووەو قیبلە دەپاڕایەوە بە دەستی بەرزکردنەوە لەدوای جەمری یەکەم و دووەم ، بەڵام لەلای (جمرە العقبە) دا زیخەکەی دەهاوێشت و تەکبەری دەکرد لەگەڵ هەموو زیخێکداو دەڕۆیشت و لەلایدا نەدەوەستا )

## لەکاتی سەرسوڕمان و بینیبی شتی سەیردا

1ـ ( سبحان الله ) ، واتە : پاک و بێ گەردی بۆ خوایە .

2ـ ( الله أكبر ) ، واتە : خوا گەورەیە .

## چی ئەکات ئەگەر هەواڵێکی خۆشی بۆ هێنرا

( كان النبي صلى الله عليه وسلم إذا أتاه أمر يسرهُ أو يسرُّ به خر ساجداً شكراً لله تبارك وتعالى ) ، واتە : پێغەمبەری خوا دروودی خوای لێبت ئەگەر هەواڵێکیان بۆ بهێنابایە دڵی خۆش بکردایە یان پێی دڵ خۆش بووایە کوڕنووشی دەبرد لە سوپاسی خوای گەورەدا .

## چی دەڵێیت ئەگەر لە چاوی خۆی ئەترسا بدا لە شتێک و ببێتە هۆی زیان پێ گەیاندنی

( ما شآء الله لا قوة إلا بآلله ( اللهم بارک علیه ) ) ، واتە : ئەوەی خوای گەورە ویستی ببێت دەبێ و هێزو توانایەک نی یە مەگەر بەخواوە ، خوایە فەڕو بەرەکەتی تێ بخە .

پێغەمبەری خوا دروودی خوای لێبێت دەفەرموێت : ( ئەگەر یەکێک لە ئێوە شتێکی لەبراکەی یان لە خۆی یان لە ماڵ و سامانی دا بینی کە سەرسامی کردبوو وە بەلایەوە سەیر بوو ( با بپارتەوە بۆی بە بەرەکەت ) ، چونکە چاو ڕاست و ڕەوایە .

## ئەگەر لە چاوی یەکێک ترسایت

( سورەتی ( الفلق ) و (الناس ) بخوێنە ) .

## ئەگەر کەسێک چاو لێی دا

( با چاو پیسەکە دەست نوێژ بگرێت و پاشان ئاوی دەست نوێژەکە بکەن بەسەر ئەو کەسەدا کە چاو لیی داوەو خۆی پێ بشوات ) .

## داوای لێ خۆش بوون کردن و گەرانەوە بۆ لای خوای گەورە (الإستغفار والتوبة)

1- پێغەمبەری خوا دروودی خوای لێبێت دەفەرموێت : ( واللہ إني لاستغفر الله وأتوب إليه في اليوم أكثر من سبعين مرة ) ، واتە : سوێند بەخوا من لە ڕۆژێکدا زیاد لە حەفتا جار داوای لێ خۆش بوون دەکەم لە خوای گەورەو دەگەرێمەوە بۆلای .

2ـ وه‌ چاک وایه‌ لـه‌ ڕۆژێک دا ( سه‌د ) جار بوترێ ( أستغفر الله وأتوب إليه ) ، واتـه‌ : داوای لـی خۆشبوون لـه‌ خوای گه‌وره‌ ده‌که‌م و ده‌گه‌ڕێمه‌وه‌ بۆلای .

3ـ پێغه‌مبه‌ری خوا درووردی خوای لێبێت ده‌فه‌رموێت : ( يا أيها الناس توبوا إلى الله فإني أتوب في اليوم إليه مائة مرةً ) ؛ واتـه‌ : ئـه‌ی خه‌ڵكی بگه‌ڕێنه‌وه‌ بۆ لای خوا ، به‌ ڕاستـی من لـه‌ ڕۆژێک دا (سه‌د) جار ده‌گه‌ڕێمه‌وه‌ بۆ لای .

4ـ پێغه‌مبه‌ری خوا درووردی خوای لێبێت ده‌فه‌رموێت : ( من قال أستغفر الله العظيم الذي لا إله إلا هو الحي القيوم وأتوب إليه ، غفر الله لهُ وإن كان فر من الزحف ) واتـه‌ : هه‌ر که‌سێک بڵێ : داوای لێ خۆش بوون ده‌که‌م لـه‌و خودا مه‌زنه‌ی که‌ هیچ په‌رستراوێک نی یه‌ به‌هه‌ق جگه‌ لـه‌و ، وه‌ زیندووی هه‌ڵسووڕێنه‌ری بوونه‌وه‌ره‌و ده‌گه‌ڕێمه‌وه‌ بۆ لای ، ئـه‌وا خوای گه‌وره‌ لێی خۆش ده‌بێ ئه‌گه‌ر چی لـه‌کاتـی به‌ره‌نگاربوونه‌وه‌ی دوژمن پشتـی هه‌ڵکردبی و ڕای کردبێ .

5ـ پێغه‌مبه‌ری خوا درووردی خوای لێبێت ده‌فه‌رموێت : ( أقرب ما يكون الربُّ من العبد في جوف الليل الآخر فإن استطعت أن تكون ممن يذكر الله في تلك الساعة فكن ) ، واتـه‌ : نزیک ترین کاتێک که‌ په‌روه‌ردگار لـه‌ به‌نده‌که‌یه‌وه‌ نزیک بێت لـه‌ ناوه‌ڕاستـی کۆتایی شه‌ودایه‌ ، ئه‌گه‌ر توانیت لـه‌و که‌سانه‌بێت که‌ یاسی خوای گه‌وره‌ ده‌که‌ن لـه‌و کاتـه‌دا ئـه‌وا ببه‌ .

6ـ پێغه‌مبه‌ری خوا درووردی خوای لێبێت ده‌فه‌رموێت : ( أقرب ما يكون العبد من ربه وهو ساجد فأكثروا الدعاء ) ، واتـه‌ : نزیک ترین کاتێک که‌ په‌روه‌ردگار لـه‌ به‌نده‌که‌یوه‌ نزیک بیت لـه‌ ناوه‌ڕاستـی کۆتایی شه‌ودایه‌ ، ئـه‌گه‌ر توانیت لـه‌و که‌سانه‌بێت که‌ یادی خوای گه‌وره‌ ده‌که‌ن لـه‌و کاتـه‌دا ئـه‌وا ببه‌ .

7ـ پێغه‌مبه‌ری خوا درووردی خوای لێبێت ده‌فه‌رموێت : ( إنه ليغان على قلبي وإني لاستغفرُ الله في اليوم مائة مرة ) ، واتـه‌ : تـارمایی دێت به‌سه‌ر دڵم داو بیرم ده‌چێ ، وه‌ من لـه‌ ڕۆژێک دا (سه‌د) جار داوای لێخۆش بوون لـه‌ خوای گه‌وره‌ ده‌که‌م .

## فـه‌زڵـی ( تـه‌سبیح و تـه‌حمیدو تهلیل و تـه‌کبیر ) کردن

تـه‌سبیح واتـه‌ (سبحان الله ) کردن ، وه‌ تـه‌حمید واتـه‌ ( الحمد لله ) ، وه‌ تـه‌هلیل واتـه‌ وتنـی ( لا إله إلا الله ) ، وه‌ تـه‌کبیر واتـه‌ ( الله أكبر ) کردن .

1ـ پێغەمبەری خوا درووودی خوای لێبێت دەفەرموێت : ( من قال : (سبحان الله وبحمده) في يوم مائة مرة حطت خطاياه ولو كانت مثل زبد البحر ) ، واتە : هەر کەسێک لە ڕۆژێک دا (سەد) جار بڵێ پاکی و بێ گەردی و ستایش بۆ خوایە ، ئەوا گوناهەکانی دەسڕێتەوە ئەگەر چی وەکو کەفی دەریاش وابێت .

2ـ پێغەمبەری خوا درووودی خوای لێبێت دەفەرموێت : هەر کەسێک لە ڕۆژێکدا سەد جار بڵێ : ( من قال لا إله إلا وحده لا شريك لهُ ، لهُ الملك ، ولهُ الحمدُ ، وهو على كل شيء قدير ) واتە : هیچ پەرستراوێک نی یە جگە لە (اللـه) تاکی بێ هاوەڵەو موڵک و ستایش بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێک دا بە توانایە ..... ئەوا بە ئەندازای ڕزگارکردنی کۆیلەیەک چاکەی دەست دەکەوێت و (سەد) چاکەی بۆ دەنوسریت و(سەد) گوناهی لێ دەسڕێتەوەو کەس بە پاداشتی لەم چاکترەوە نایەت مەگەر کەسێک لەم زیاتر بکات .

3ـ پێغەمبەری خوا درووودی خوای لێبێت دەفەرموێت : ( كلمتان خفيفتان على اللسان ، ثقيلتان في الميزان حبيبتان إلى الرحمن : سبحان الله وبحمده سبحان الله العظيم ) واتە : دوو ووشە هەن کە لەسەر زووبان سوکن و لە تەرازووی کردەوەکاندا قورسن و بەلای خواوە خۆشەویستن ئەویش بریتی یە لە ووتنی : پاکی و بێ گەردی و ستایش بۆ خوایە ، پاکی و بێ گەردی بۆ خوای مەزن .

4ـ لە أبي أيوب الانصاری ڕوزای خوای لێبێت : پێغەمبەری خوا درووودی خوای لێبێت فەرمووی : (من قال لا إله إلا وحده لا شريك لهُ ، لهُ الملك ، ولهُ الحمدُ ، وهو على كل شيء قدير عشر مرات . كان كمن أعتق أربعة أنفس من ولد إسماعيل ) واتە : هەر کەسێک دەجار بڵێ : هیچ پەرستراوێک نی یە بەهەق جگە لە (اللـه) تاکی بێ هاوەڵە و موڵک و ستایش بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێک دا بە توانایە ، وەکو ئەوە وایە کە چوار کەسی لە نەوەکانی ئیسماعیل پێغەمبەر (عليـه الصلاة والسلام) ئازادو ڕزگارکردبێت .

5ـ پێغەمبەری خوا درووودی خوای لێبێت دەفەرموێت : ( لأن أقول سبحان الله ، والحمد لله ،ولا إله إلا الله ، والله أكبر ،أحب إلي مما طلعت عليه الشمس ) ، واتە : ئەگەر بڵێم پاکی بێ گەردی وستایش بۆ خوا و هیچ پەرستراوێک نی یە

بەهەق جگە لە (اللە) و خوا گەورەیە ، خۆشترە بەلامەوە لە هەموو ئەو شتانەی کە خۆر بەسەری دا هەڵدێ .

6ـ سەعەد ڕەزای خوای لێبێت دەفەرموێ : ئێمە لە خمەت پێغەمبەری خوادا دروودی خوای لێبێت بووین فەرمووی : ( أيعجز أحدكم أن يكسب كل يوم ألف حسنة فسأله سائل من جلسائه كيف يكسب أحدنا ألف حسنة ؟ قال : يسبح مائة تسبيحة ، فيكتب له ألف حسنة أو يحط عنهُ ألف خطيئة ) واتە : ئەیا کەس لە ئێوە هەیە بێ توانا بێ لەوەی کە هەموو ڕۆژێ هەزار چاکە دەست بخات بۆ خۆی ؟ یەکێ : لەوانی کە دانیشتبوو پرسیاری لێ کرد : چۆن یەکیک لە ئێمە دەتوانێ هەزار چاکەی دەست بکەوێ ؟ فەرمووی : سەد تەسبیحات ( سبحان الله ) بکات هەزار چاکەی بۆ دەنوسرێ ، یان هەزار گوناهی لێ هەڵدەوەرێت .

7ـ لە جابر خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی : پێغەمبەری خوا دروودی خوای لێبێت فەرمووی : ( من قال سبحان الله العظيم وبحمده غرست له نخلة في الجنة ) ، واتە : هەر کەسێک یەک جار بڵێ پاکی و بێ گەردی و ستایش بۆ خوای مەزن ، دارخورمایەکی لە بەهەشت دا بۆ داڕوێت .

8ـ لە عبداللە ی کوڕی قیسەوە ڕەزای خوای لێبێت : (قال صلى الله عيه وسلم : يا عبد الله بن قيس ألا أدلك على كنز من كنوز الجنة ؟ فقلت:بلى يا رسول الله ، قال : قل لا حول ولا قوة إلا بالله ) ، واتە : ئەی عبداللەی کوری قیس ئایا گەوهەرێک لە گەوهەرەکانی بەهەشتت پێ بڵێم ؟ وتم : بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ، فەرمووی : بڵێ هیچ گۆڕان و هێزێک نی یە مەگەر بە خوای گەورەوە .

9ـ لە سعدی کوڕی وقاص ڕەزای خوای لێبێت فەرموی : (جاء أعرابي إلى رسول الله صلى الله عيه وسلم فقال: علمني كلاماً أقوله : قال " قل لا إله إلا الله وحده لا شريك لهً ،الله أكبرُ كبيراً ، والحمد لله كثيراً ، سبحان الله رب العالمين ،لا حول ولا قوة إلا بالله العزيز الحكيم " قال فهؤلاء لربي فما لي ؟ قال : " قل: اللهم اغفر لي ،وارحمني ،واهدني وارزقني ) واتە : دەشتەکی یەک هاتە خزمەت پێغەمبەر درودی خوای لێبێت فەرمووی : ووتەیەکم فێربکە کە بیڵێم ، فەرمووی : بڵێ هیچ

پەرستراوێک نی یە بەهەق جگە لە (اللـه) تاکی بێ هاوبەشە ، خوا گەورەیە زۆر ستایشی خوا دەکەم ، پاکی و بێ گەردی بۆ پەروەردگاری جیهانیانەو هیچ توانایەک نی یە مەگەر بە خوای دەسەڵاتداری کاربەجێ وە ، دەشتەکی یەکە ووتی : ئەمانە بۆ ( ستایش کردن ) ی پەروەردگارمە ، ئەی چی بۆ ( نزاو پاڕانەوە) ی خۆمە : بڵێ : خوایە لێم خۆش بەو ڕەحمم پێ بکەو ڕێنمایم بکەو ڕۆزیم بدە .

10 ـ طارقی ئەشجەعی دەفەرموێ : پێغەمبەری خوا درودی خوای لێبێت فەرمووی : ( كان الرجل إذا أسلم علمه النبي صلى الله عليه وسلم الصلاة ثم أمره أن يدعو بهؤلاء الكلمات :" اللهم اغفر لي، وارحمني ،واهدني ، وعافني وارزقني ) ، واتە : ئەگەر هەرکات پیاوێک موسوڵمان بوایە پێغەمبەری خوا درودی خوای لێبێت فێری نوێژی دەکردو پاشان فەرمانی پێ دەکرد کە بەم ووشانە بپاڕێتەوە : خوایە لێم خۆش ببەو ڕەحمم پێ بکەو ڕێنمایم بکەو بمپارێزەو ڕۆزیم بدە .

11 ـ پێغەمبەری خوا درودی خوای لێبێت دەفەرموێت: ( الباقيات الصالحات : سبحان الله والحمد لله ، ولا إله إلا الله ،والله أكبر ،و لا حول ولا قوة إلا بالله ) ، واتە : ئەو چاکانەی کە دەمێنێتەوە بریتی یە لە ووتنی : پاک و بێ گەردی بۆ خوایە و ستایش بۆ خوایەو هیچ پەرستراوێک نی یە بەهەق جگە لە (اللـه) و خوا گەورەیەو گۆڕان و هێزێک نی یە مەگەر بەخوای گەورە .

## پێغەمبەری خوا چۆن تەسبیحاتی دەکرد ؟

( عن عبد الله بن عمرو رضي الله عنهما قال : "رأيت النبي صلى الله عليه وسلم يعقد التسبيح بيمينه ) ؛ واتە : پێغەمبەری خوام بینی بە دەستی ڕاستی تەسبیحاتی دەکرد .

( لە یەسیرەی ژنە صەحابەی بەڕێزەوە ڕەزای خوای لێبێ ڕیوایەت کراوە کە پێغەمبەری خوا درودی خوای لێبێ فەرمانی پێ کردووم کە ئاگایان لە تەسبیحات و بە بەرزو پیرۆزی ڕاگرتنی خوای گەورە بێت و بە ( ئەنامیلەکانیان ) ئەنجامی بدەن ( کە بریتی یە لەو ئاوساویانەی کە لەسەری هەموو پەنجەیک دا هەیە ) چونکە لە ڕۆژی دوایی دا پرسیاریان لێ دەکرێت و دێنرێنە گۆو دەبنە شایەت .

سەرچاوەكان :

لە ذیكرەكانی ڕۆژانە لە قوریان و سوننەتدا ... حەمزە بەرزنجی

حصن المسلم ..... القحطاني

أذكار الصباح والمساء .... الدكتور عبدالله عزام

صحيح الكلم الطيب ... لشيخ الاسلام ابن تيميه

www.regayrasty.com